# پزیشکی دادوەری

پزیشکی دادوەری (پزیشکی شەرعی، پزیشکی پزیشکی یاسایی) لە دوو وشە پێکدێت یەکەم پزیشکی واتە بریتیە لە یەکێك لە زانستە پزیشکیەکان و سەرچاوەی بابەتەکانی پێکهاتووە لە بابەتەکانی بنەڕەتی پزیشکی وەك توێکاری (تشریح) کارئەندامزانی (فسلجة) دەرمانزانی (الادوية).... وەهەروەها زانستە پزیشکیە کلینیکیەکان (العلوم الطبية السريرية...) وەمەرجە ئەو کەسەی کاری پزیشکی دادوەری بەڕێوەدەبات پزیشك بێت، واتە دەرچووی کۆلیژی پزیشکی بێت.

ووشەی دووەم بریتیە لە دادوەری یا یاسایی یا شەرعی واتە بابەتەکانی بریتین لەو لایەنە پزیشکیانەی کە لایەنەکانی لێکۆڵینەوە (الجهات التحقيقية) داوای رای پزیشك دەکات بۆ ڕوونکردنەوە و دیاریکردنی حالەتی پزیشکی لە ڕووداوەکانی جێبەجێکردنی یاسا (الوجه الطبي في الوقائع القضائية)

کورتەیەکی مێژوویی:

پزیشکی دادگوزاری هەر لەکۆنەوە لەگەڵ مارەسەی پزیشکی دادگوزاری پەیدابووە، سەرەتا پیاوانی ئایینی کەکاروباری پزیشکیان بەڕێوەدەبرد لایەنی پزیشکی دادگوزاریشین ئەنجام دەدا هەندێ بەڵگە هەن کە کۆنترینیان دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٥٠٠٠ ساڵ پێش زایین لەسەر ئەنجامدانی کاروباری پزیشکی دادگوزاری، لەگەڵ پەیدابوونی پزیشك دەرچووی خوێندنگای پزیشکی ئەم ئەرکە کەوتە ئەستۆی پزیشك (پزیشکی گشتی) تا پەیدابوونی پسپۆری دادگوزاری لەسەدەی نۆزدە کە ئەڵمانیای قەیسەری دەستپێشخەربوو، لە ئەڵمانیاوە هەر لەسەدەی شازدەوە خوێندنی پزیشکی دادگوزاری دەستی پێکرد وە لەعراق لەساڵی ١٩٢٧ لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی بغداد بۆ یەکەم جار وەك وانەیەك خوێندرا کەبەردەوام بوو تا ئێستا کە لە قۆناغی چوارەم لە هەموو کۆلیژە پزیشکیەکان دەخوێندرێ، لەساڵی ١٩٣٢ دکتۆر احمد عزت القيسي یەکەم پسپۆری پزیشکی دادگوزاری بوو لە عراق، لە ساڵی ١٩٣٩ لە بغداد بۆ جاری یەکەم پەیمانگای پزیشکی دادگوزاری دامەزرا کە وەك سەرچاوەیەکی کاروباری پزیشکی دادگوزاری بوو کە پسپۆرانی پێدەگەیاند

لەیال ئەنجامدانی کاری . اری ادگوزاری، لەکوردستانیش بۆ یەکەمجار لە هەولێر پەیمانگای پزیشکی دادگوزاری دامەزرا لەساڵی ٢٠٠٢.

**پێناسە**: پزیشکی دادگوزاری لقێکە لە لقەکانی پزیشکی کە تایبەتە بە ئەنجامدانی لایەنی پزیشکی لە ڕووداوە دادیەکان.

ئامانجەکان: ڕۆشنایی خستنە سەر کردارێکی ماددی ڕوویداوە لە ڕابردوو یان گومان لە ڕوودانی هەیە، وە ئامرازی پێکردنی کردارەکە، چۆنیەتی ڕوودانی کردارەکە، کاتی ڕوودانی کردارەکە، دەستنیشانکردنی دەرئەنجامەکانی وەزۆر شتی تر کە پیاوانی یاسا پێویست بە زانینی ڕووی پزیشکی دەکات لەڕووداوە دادیەکان.

**لایەنەکانی پزیشکی دادگوزاری:**

پشکنەر (الفاحص): بریتیە لە هەرکەسێك پشکنین ئەنجام بدات یا ڕای وەرگیری لە ڕووداوە دادیەکان کە ئەمانە دەگرێتەوە پزیشکی دادگوزاری، پسپۆری مۆری پەنجە، پسپۆری چەك، شارەزای لێکۆڵینەوە.....هتد.

پشکنینراو (المفحوص): ئەوەی پشکنینی لەسەر ئەنجام دەدرێ کەئەم گروپانە دەگرێتەوە:

١. زیندووەکان (الأحياء): ئەو کەسانەن کە بە زیندوویی دەنێردرێن بۆ پشکنین، وەك ئەوانەی بریندارن، ئەوانەی دەنێردرێن بۆ زانینی تەمەنیان، ئەوانەی تاوانی سێکسیان ئەنجام داوە ....هتد.

٢. مردووەکان (الموتى) ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە: تازە مردوون، ماوەیەك بەسەر مردنیان تێپەڕیوە، لاشەی بۆگەنبوو، پارچەکانی لاشەی مردوو وخۆڵەمێشەی لاشە.

٣. نموونە وپشکنینەکانی تاقیگە (النماذج والفحوص المختبرية) وەك: خوێن، تۆماو، ڕشانەوە، داوەموو، قوتووی دەرمان، جل وبەرگ، چەك....هتد کە دەنێردرێن بۆ تاقیگەکان بۆ پشکنین.

٤. گروپی پشکنینی شوێنی ڕووداو: بینینی شوێنی ڕووداو گرنیەکی زۆری هەیە کە پزیشکی دادگوزار بیرۆکەیەکی دروستدەکات لەسر چۆنیەتی ڕووداو وکات وئامرازی تاوان وجۆری هۆکاری مردن کەتاوانکاریە یاخوت خۆکوژیە وەهەروەها گەلێ زانیاریتر کە لەشوێنی ڕووداوی بەرچاوی

دەکەوێت وسەرنجی ڕادەکێشێ، ئامادەبوونی پزیشک بۆ شوێنی ڕووداو لە ڕێگای داواکاری لێکۆڵەرەوەی دادی دەبێت.

٥. گرووپی گۆڕ هەڵدانەوە: هەندێ جار داواکیە پزیشکی داد دەکرێ بۆ ئامادەبوون بۆ هەڵدانەوەی گۆڕی کەسانێک کە گومان لە چۆنیەتی مردن دەکرێ یاخود بۆ دەستکەوتنی هەندێ زانیاری، ئەمەش بە داوایکی فەرمی یان بە گوتەی دەم (شفهی) یان بەتەلەفۆن داوای پزیشک دەکرێ. ئامادەبوان بریتین لە: بەرپرسی لێکۆڵینەوە، پیشاندەری گۆڕ، کارگەر(عەمەلە) پزیشکی داد و یاریدەدەری وە چەند پۆلیسێک. هەندێ جار پزیشک دەتوانێ هەر لەجێگای گۆڕەکە وەلامی پرسیارەکان بداتەوە بەلام زۆربەی کات تەرمەکە دەبێت ببرێت بۆ پزیشکی دادگوزاری بۆ پشتکنینی ورد.



## ناردنی پشکێنراو بۆ پشکنینی پزیشکی دادگوزاری

(احالة المفحوص الى الفحص الطبي العدلي)

١) ناردنی زیندوو: پێویستە لێکۆڵەرەوەی دادی نوسراوێکی فەرمی ڕێک بخات کە ناو وتەمەن ورەگەزی کەسی نێردراو بنووسێ وە جۆری پشکنینی پێویست لەگەل کورتەیەک لە ڕووداوەکە، وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگی نوێ لەلای چەپی نوسراوەکە دەدات ومۆر وواژوو لەسەر وێنەکە دەکات ومۆر لە باسکی چەپی نێردراو ددات وبەدەستی پۆلیسێک دەینێرێت ودوو وێنەیتری لەگەل دەنێردرێت تاوەکوو لە نوسراوی وەلام بدرێت. ئەم جۆرە ناردنە تەنها لە حالەتی گرنگ پەیرەو دەکرێت وەک دیاریکردنی تەمەن و تاوانەکانی سێکسی کەچی ل ڕووداوەکانی ڕۆژانە وەک ڕووداوەکانی ڕێگاوبان وشەڕکردن تەنها دەستنووسێک یان نوسراوێکی فەرمی دەکرێت کە ناو وتەمەن ورەگەز لەگەل جۆری پشکنین تێدا دەنوسرێت.

٢) ناردنی مردوو: لێکۆڵەرەوەی دادی نوسراوێکی فەرمی ڕێک دەخات کە ناو وتەمەن ورەگەزی تەرمەکە(وەئەگەر نەناسراو بوو ئەوا درێژی، قەلەوی، ڕەنگی دەم وچاو، ڕەنگی موو وجل وبەرگی دەنووسێت) وە جۆری پشکنینی داواکراو لەپال هۆی مردن دەنووسێت، پێویستە هەمان زانیاری ناو وتەمەن ورەگەز لەکارتۆنێک بنوسرێت ولەمەچەکی تەرمەکە بدرێت.

٣

ناردنی جیٚماوی کەس(جل وبەرگ وپشکنینی تاقیگەیی - المحرزات): لیٚکۆڵەرەوەی دادی نوسراویٚکی فەرمی ڕیٚك دەخات کەناو وتەمەن ورەگەز وتاوی هەموو ئەو جیٚماوانەی کەسی نیٚردراوەکە دەنووسیٚت، پیٚویستە جل وبەرگ لەناو نایلۆن بخریٚت، داوە موو ونینۆك وحەب وشتی تری ڕەق لەناو زەرفی کاغەز وەشلەش لەناو قەنینەی شووشە یان پلاستیك بخریٚت هموو ئەمانە سەریان باش دادەخریٚت ومۆری لیٚدەدریٚت تاوەکو نەکریٚنەوە وەلەسەر هەریەکەیەکیان ناو وتەمەن ورەگەزی خاوەنەکەی وجۆری شتەکە دەنوسریٚت ئنجا بەدەستی پۆلیسیٚك دەنیٚردریٚت.

## ئەو حالەتانەی پیٚویستیان بەراپۆرتی پزیشکی دادی هەیە

(دەبیٚ بنیٚردریٚن بۆپزیشکی دادی)

- هەموو جۆرەکانی برین تاوانکاری بیٚت یان نا وەك ڕووداوەکانی ڕیٚگاوبان(حوادث الطرق)بەهۆی پیٚکانی ئۆتۆمبیٚل یان لیٚکدان وەیان وەرگەڕان ، کەوتن چ لەبەرزایی بیٚت یان لەسەر زەوی، شەڕکردن وبەرکەوتنی ئامرازی تیژ یان یان.....هتد.
- سووتان بەهەر هۆیەك.
- گەستن وپیٚوەدانی میٚروو وئاژەڵ.
- ژەهراویبوون بەهەر هۆیەك.
- ڕووداوەکان وتاوانکاریەکانی کۆئەندامی زاوزێ.
- مردنی کت وپڕ وەیان نەزانراو. ٦- مردنی کتوپڕ وەیان نەزانراو.
- مردن لەهۆڵی نەشتەرگەری بەتایبەتی ئەگەر داواکاری لەسەر هەبیٚت.
- مردن لە نەخۆشخانەکانی دەروونی.
- مردن لەبەندیخانە وگرتووخانە.
- مردن لەکاتی ئیشکردن.
- مردنی کەسیٚك ژیانی خۆی (تأمین) کردبیٚ.



## ڕاپۆرتی پزیشکی دادگوزاری

ئەو ڕاپۆرتانەن کە پزیشك دەینووسێ لەسەر داواکاری لایەنەکانی لێکۆڵینەوە.

**ڕاپۆرتی بەرایی (سەرەتایی-التقرير الاولي)** ئەمەش پزیشکی نیشتەجێی خولاو (مقيم دوري) (وەهەندێ جار پزیشکی شارەزا) دەینووسێ لە نەخۆشخانەی فریاکەوتن لەشارەکان ونەخۆشخانەکانی قەزا وناحیەکان بۆ کەس زیندووی ڕەوانەکراو لەلایەن لێکۆڵەرەوەی دادی بۆ ڕووداوەکانی ڕۆژانە، فۆرمی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکراو کەپزیشکەکە دوای تۆمارکردنی ناو وتەمەن ورەگەزی پشکێنراو وکات وشوێنی پشکنین باسی باری هۆشداری ونیشانە زیندەگیەکان (العلامات الحيويه) دەکات هەموو ئەو برین وبەرکەوتنەکان وەسف دەکات وشوێن ودرێژی وقوڵایی برینەکان وئامرازی هۆکار دیاریدەکات بەیەك لەم چەند شێوەیە کۆتایی پێدەهێنێ:

- ١- ❖ پشکنینی کۆتایی کاتێ کەسەکە هیچ برینی لەلەش نەبێت وەیان برینەکەی سووکە پێویستی ناوێت. سووکەو پشکنین نادرێت ..
- ٢- ❖ داواکردنی دووبارە پشکنینەوە بەپێی ئەو کاتەی پزیشك دیاریدەکات.
- ٣- ❖ داخلکردنی کەسی نێردراو لەو حاڵەتانەی کە پێویستی بە چاودێری پزیشکی هەیە.
- ٤- ❖ ڕەوانەکردنی بۆ لایەنی پەیوەندیدار وەك پەیمانگای پزیشکی دادگوزاری بەتایبەتی لە ڕووداوەکانی سێکسی.

**ڕاپۆرتی دەوری (ناوبەناو)** بۆ ئەو کەسانە ڕێکدەخرێ کە لەنەخۆشخانە داخل دەکرێن وبۆ ماوەیك دەمێننەوە/ لەم ماوەیە پزیشکی پسپۆری سەرپەرشتیکەری کەسەکە (پشکێنراوەکە-بریندارەکە) ڕاپۆرتێك دەنووسێ کە تێیدا خۆی دەناسێنێ بە ناوی سێیانی وپسپۆرییەکەی وئاماژەپێکردن بە ڕاپۆرتی سەرەتایی باس لە وەرگرتن وچارەسەری سەرەتایی کەسەکە دەکات وچی بۆ کردووە وچ چارەسەریەکی داوەتێ وئێستا باری تەندروستی چۆنە، ئەم ڕاپۆرتانە بە لایەنی کەمەوە دەبێ هەفتەی جارێك بنووسرێ تاوەکوو لایەنی لێکۆڵینەوە ئاگاداری تەندروستی کەسەکە بێت، بۆ نووسینی ئەم ڕاپۆرتانە

پێویستناکات لایەنی لێکۆڵینەوە(لێکۆڵەرەوەی دادی) نوسراو بکات بە نووسینی ئەم راپۆرتە.

**راپۆرتی کۆتایی/** لەسەر داوای(نوسراوی) لایەنی لێکۆڵینەوە ئەم راپۆرتە لەلاین پزیشکی پسپۆر(سەرپەرشتیکەری کەسەکە-بریندارەکە) بۆ ئەو کەسانە رێکدەخرێ کە دووبارە دەنێردرێنەوە بۆ پشکنین یان لە-کۆتایی چارەسەری ئەو کەسانەی کە لە نەخۆشخانە داخل ببوون تاوەکوو بزانن ئایا بەتەواوی چاکبونەتەوە وەیان ئەگەر توشی ناتەواوی(عجز عطل) هاتوونە وەدیاریکردنی (درجة العجز)کە لەلایەن لیژنەی تایبەت دەبێت.

**راپۆرتی توێکاری(تشریحی):** تەنها بۆ ئەو تەرمانە دەکرێن کە لایەنی لێکۆڵینەوە داوای توێکاری مردوو دەکات تاوەکوو بزانێ هۆی مردن چییە وپرسیاری تر بەپێی حالەتی مردنەکە، ئەم راپۆرتانە تەنها لەلایەن پزیشکی دادگوزاری دەنووسرێ دوای توێکاری کە تێیدا باس لە رواڵەتی برینی دەرەوەی وشانەوەی تەرمەکە دەکات وەڵامی پرسیارەکانی لایەنی لێکۆڵینەوە دەداتەوە.



## هاوکاری نێوان لایەنی لێکۆڵینەوە وپزیشک

پشکنینی پزیشکی دادوەری کارێکی هاوبەشە نێوان لایەنی لێکۆڵینەوە(لێکۆڵەرەوەی دادوەری-المحقق العدلی) وپزیشک، لێکۆڵەرەوەی دادوەری یەکەم لایەنە لە چوونە جێگای رووداو وئاگاداری چۆنیەتی رووداوەکە، وە پزیشکی دادگوزار کارەکەی بریتیە لە جێبەجێکردنی داواکاریەکانی لێکۆڵەرەوەی دادوەری وە تەنها ئەو پشکنینە ئەنجامدەدا کەداوای لێدەکرێ وەبەرپرس نیە لە پشکنینێک کە داوای لێنەکرابێت، بۆ ئەوەی

پزیشک راپۆرتێکی ڕوون وبەسوود پێشکەش بە لایەنی لێکۆڵینەوە بکات پێویستە لایەنی لێکۆڵینەوە چەند خاڵێك ڕەچاو بکات وەك:

١) ڕوونکردنەوەی مەبەستی پشکنین: پێویستە لایەنی لێکۆڵینەوە مەبەستی پشکنین ڕوون بکاتەو کە لە لەوانەیە لە ڕووداوێك بۆ یەکێکیتر بگۆڕێ وناکرێ لە هەموو حالەتێك پشکنینی گشتی ئەنجام بدرێ کەدەبێتە هۆی ماندووبوونێکی بێ کەلك ولەدەستدانی تەرکیز بۆ شتی وورد، باشتروایە پرسیارەکان بە ژمارەبن.

٢) باسکردنی کورتەیەك لەڕووداوەکە وەك کاتی ڕووداو هۆکار وچۆنیەتی ڕووداو کە سەرنجی پزیشك بۆ هەندێ خاڵ ڕادەکێشێ کە لە لایەنی لێکۆڵینەوە سوودی دەبێت.

٣) گرنگیدان بە پشکنینی شوێنی ڕوداو ورەچاوکردنی:

أ) وەسفکردنی شوێنی ڕووداو وەك پەرت وبڵاوبوون وتێکچوونی کەل وپەلی ژوورەکە بوونی قووتی دەرمان، شووشەی شکاو، دڵۆپی خوێن، چۆنیەتی کەوتنی تەرم لەسەر زەوی....هتد.

ب) ڕەچاوکردنی ئاو وهەوا واتە ساردی وگەرمی شوێنی ڕووداو بەبەراورد لەگەڵ ئاو وهەوای دەوروبەر کە کاردەکاتەسەر دیاریکردنی کاتی ڕووداو.

ج) وەسفکردنی جێماوی شوێنی ڕووداو وەك خوێن، تۆماو، ڕشانەوە... کەیارمەتی دەدات بۆگەیشتنی بۆ خاوەنەکەی واتە ناسینەوەی تاوانبار.

٤) گرنگیدان ناردنی پشکێنراو بۆ پشکنین.

أ) کەسی زیندوو وتەرم: پێویستە بەزووترین کات ڕوانەی پشکنین بکرێن چونکە دواخستن لەوانەیە ببێتە هۆی لەدەستدانی ڕوالەتی تاوان.

ب) جل وبەرگ: پێویستە بەتەواوی وبێ پارچەکردن بنێردرێت بەتایبەتی لە ڕووداوی بەرکەوتنی گوللە وتاوانی سێکسی کەلەوانەیە هۆکاری زانینی چۆنیەتی ڕووداو ئاشکرابێت.

ت) کەل وپەل وچەك بەتایبەتی ئامرازی تیژ وەك چەقۆ وخەنجەر کە لەوانەیە خاوەنەکەی واتە ئەنجامدەری تاوان بدۆزرێتەوە بەبوونی پەنجەمۆر یان دڵۆپەخوێن لەسەر یان لەناو ئامرازەکە.

# مردن(الموت_The Death)

زانستی مردن (Thanatology):

زانستێکە سەربەخۆیە لە دیاریکردن و پۆلێن کردنی جۆرەکانی مردن.

پێناسەی مردن:

لە رووی پزیشکییەوە برتیە لە وەستانێکی نەگەڕاوەی فرمانە زیندەگییەکان لە ئەنجامی وەستانی کۆئەندامە زیندەگیەکان وەک کۆئەندامی سوڕان، کۆئەندامی دەمار وکۆئەندامی هەناسە کە دەبێتە هۆی دارمان و لەناوچوونی لەش، لەزۆربەی زۆری حالەتەکانی مردن کۆئەندامێک دەوەستێت وەستانی ئەوانەیتری بەدوادادێت وەک : کاتی وەستانی دل بەهۆی جەلتە دوای چەند دەقیقەیەک مێشک لە کار دەوەستێ ئەگەر ئۆکسجینی لە رێگای خوێن نەگاتێ ودوای ئەویش کۆئەندامیهەناسە. وەلەکاتی وەستانی مێشک بەهۆی نەخۆشی یان بەرکەوتنی هێز ئەوا کۆئەندامی هەناسە دەوەستێ و دواییش دل بەهۆی نەگەیشتنی ئۆکسجین. بەدەگمەن هەرسێ کۆندام بەیەکەوە دەوەستن وەک کاتی تەقینەوە وپارچەبوونی لەش

دەستنیشان کردنی مردن (تشخیص الموت):

بڕیاردانی ڕوودانی مردن بە پلەی یەکەم کاری پزیشکەو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەو لێی بەرپرسیارە وەدەبێت دوو پزیشک بشداریبکەن لە دەستنیشانکردنی مردن کە هەریەکەیان بەلایەنی کەم پێنج ساڵ تێپەربووبێت بەسەر تەواوکردنی کۆلیژی پزیشکی وکارکردنی وەک پزیشک. بڕیاری ڕوودانی مردن ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسە هیچ پەیوەندییەکی بە کۆمەڵگاوە نەماوە هەڵس وکەوت بە تەرمی مردووەکە و بەشەکانی بۆ مەبەستی زانستی یان چارەسەرکردن (وەک گواستنەوەی ئەندامێک لەئەندامەکانی لەشی تەرمەکە یان بڕینی بەشێک لەشانەکانی) تەنها لەو کاتە دەبێت کە مێشکی مردووبێت(لەکارکەوتووبێت) بەلام دل وهەناسەی لەکارنەکەوتووبێت(بە مغذي وهەناسەی دەستکرد بەردەوامی پێدەدرێت).

لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە بڕیاری ڕوودانی مردن دەرەنجامەکانی ترسناکەو بەرپرسیاریەتێکی گەورەیە، کەواتە با بپرسین ئایا ئەو بڕیارە کارێکی وا ئاسانە؟!!

نیشانەکانی مردن:

## ((نیشانەکانی مردن))

١. بێهۆشیی یەکی تەواو وقووڵ(Deep coma) بەمەرجێك لەئەنجامی دەرمانی بێهۆشکەر یان تێکچوونی میتابۆلیزم وتێکچوونی هۆرمۆنات نەبێت وەك نەخۆشی شەکرە یان سستی ڕژێنی دەرەقی(Hypothyroidism) وەیان بەهۆی ساردبونەوەی لەش(Hypothermia) نەبێت لەم کاتە هەستکردن بۆ کارتێکەری دەرەکی وەك ئازاردان نیە وە هەموو ماسولکەکان خاو وشل دەبنەوە کە پێیدەوترێ خاوبوونەوەی سەرەتایی یان یەکەم، ئەگەر هێلکاری مێشکEEG وەربگرین هێڵێکی ڕاست دەبینین.

٢. وەستانی ئەگەراوەی هەناسەدانی لەخۆوە (التنفس التلقائي/ Spontaneous respiration) بەمەرجێك ئەم هناسەوەستانە بەهۆی دەرمان(Neuromuscular blocking agents)نەبێت، لەم کاتە جوولەی هەناسەنابێت کاتێ سەماعە لەسەر بۆڕی هەوا یان سیەکان دادەنرێت وەیان کاتێ پارچەیەکی باریك لە پەمۆ یان کلینێکس لەبەردەم دەرچەکانی دەرەوەی هەناسەدان (دەم ولووت) دادەنێین جوولەی نابێت لەبەرنەبوونی جوولەی هەناسە، وەیان پارچە ئاوێنەیەك یان شووشەیەك دەخەینە بەردەم دەم ولووت وە چاودێری هەڵماوی بوونیان دەکەین بە هەڵمی ئاو، ئەمە ئەگەر زیندوو بێت ڕوودەدات بەڵام لە مردوودا ڕوونادات.

٣. نەمانی کاردانەوەی قەدی مۆخ(مێشك)(فقدان منعكسات جذع الدماغ—Absence of brain stem reflexes) وەك کاردانەوەی light, corneal,gag, vestibulo-cochlear reflexes

٤. وەستانی سوڕی خوێن و هەست نەکردن بە لێدانی(نبض) دڵ وخوێنبەرەکان وە لە هێلکاری دڵ ECGهێڵێکی ڕاست دەبینین واتە کارەبایی دڵ نامێنێ.

### جۆرەکانی مردن

١- مردنی کلینیکی (الموت السريري):

بریتیە لە وەستانی کۆتایی(نهائی)ی فەرمانە زیندەگییەکان، ئەمەش بە بینینی نیشانەکانی مردن دەبێت کاتی پشکنینی سەریری

٢- مردنی بەرواڵەت \ مردنی هەڵواسراو(الموت الظاهري\ الموت المعلق \ Suspended death):

بریتیە لە وەستانێکی کاتی فرمانە زیندەگییەکان. بۆ نموونە لەکاتی لێدانی کارەبا ڕوودەدات کاتێك کە هەناسە دەوەستێت بەڵام کۆئەندامی سوڕان ودڵ کاردەکەن یاخود لە حاڵەتی نقووم بوون کە تیایدا کۆئەندامی هەناسە دەوەستێت بەهۆی پڕبوونی بە ئاو، پێی دەوترێ هەڵواسراو چونکە ئەگەر فریای بکەوین لە ماوەی چەند دەقیقەیەك بە هەناسەی دەستکرد ومەساجی دڵ ئەوا ژیانی دەگەڕێتەوە بەپێچەوانەوە دەمرێت.

٣- مردنی جەستەیی (الموت الجسماني):

بریتیە لە وەستانی کۆتایی فەرمانە زیندەگییەکان لە هەموو ئەندامەکان بۆیە ئەندامەکە ئیش ناکات بەڵام بەشە بنەڕەتییەکان کە خانەکانن بەزیندوویی دەمێننەوە بۆ چەند خولەکێك، هەندێ خانە بەتایبەتی هی پێست لەوانە دروستکەری ڕیشاڵ (Fibroblast) بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك وەلەوانەیە چەند ڕۆژێك دوای مردن بە زیندوویی بمێننەوە. بەپێچەوانەی خانەکانی مێشك کە دوای چەند دەقیقە ... دوای چەند دەقیقەیەك دەمرن

٤- مردنی خانەکان (الموت الحجيري):

بریتیە لە کارکەوتن ولەدەست دانی تایبەتمەندییەکانی ژیان لەخانەکاندا، ئەمەش لەدوای مردنی جەستەیی ڕوودەدات بەچەند کاتژمێرێك، خانەکانی مێشك لەپێش هەموو خانەکانیتر دەمرن کەچی خانەکانی پێست لەوانەیە بۆ چەند ڕۆژێك بمێنن وەك فایبرۆبلاست.

٥- مردنی جێجێ (الموت الموضعي): بریتیە لە مردنی چەند شانەیەك کە بەشێکن لە لەشێکی زیندوو بۆ نموونە (infarction). وە (necrosis) وەیان لاڕەشە (gangrene).

## گواستنەوەی ئەندامی مردوو

هەندێ کەس لەولاتانی ڕۆژئاوا ئامادەیی خۆیان دەردەبڕن کە کاتێ مردن سوود لە جەستەیان وەربگیرێ بۆ ڕزگارکردنی ژیانی هەندێ نەخۆش بۆ ئەم مەبەستە کاردی تایبەت هەڵدەگرن کە کاردی ئەندام بەخشی پێدەگوترێ (التبرع بالأعضاء)، ئەمەش تەنها لەو حاڵەتی مردنانە دەبێت کە کەسەکە بە مردنی مێشك

بمرێت وەك شێرپەنجەی مێشك یان جەڵتەی مێشك یان ئەزیەتخواردنی مێشك بە ڕووداوی ڕێگاوبان،یان برینداربوون ومردنی مێشك بەهەر هۆیەك بێت لەم حاڵەتانە كاتێ مێشك لەكاردەوەستێ لەنەخۆشخانە پزیشكەكان لەڕێگای هەناسەی دەستكرد ودەرماندانی-بەردەوام ژیانی ئەندامەكانیتری لەش ڕادەگرن(چونكە لەگەڵ وەستانی ئەندامەكانی لەش ناتوانرێ سوود لەهیچ ئەندامێك وەربگیرێ بێجگە لە (قرنیە) چاو)، كاتێ مێشتا لاشەكە لەسەر هەناسەی دەستكردە ودڵیشی بەردەوامە لەكار دەتوانرێت زۆربەی ئەندامەكانی لێبكرێتەوە( وەك گورچیلە، جەرگ، سییەكان، دڵ وریخۆڵەكان) و بگوازرێتەوە بۆ كەسانی نەخۆش بە پەككەوتنی ئەو ئەندامانە..

١

گۆڕانكاریەكانی جەستە دوای مردن(تغیرات الجثة بعد الموت_Changes after death)

١- ساردبوونەوەی لەش و لەدەست دانی گەرمی(تبرد الجثة_Cooling).

٢- پەڵەكانی مردن(الانحدار الدموي_التلون الموتي_Post-mortem hypostasis).

٣- رەقبوونی مردن(الصمل_التيبس الموتي_Rigor mortis).

٤- بۆگەن بوون(التفسخ_ التعفن_Post-morem decomposition.

٢

ئەو گۆڕانانەی كە لە چەند بارێكی دیاریكراو ڕوودەدەن:

١- بە شەمێ بوونی مردن(التصبن_Adipocere).

٢- بە مۆمیابوون(التحنط_Mummification).



## ساربوونەوەی لەش

لەدەستدانی گەرمی لەش ڕاستەوخۆ دوای مردنی جەستەیی ڕوودەدات واتا دوای وەستانی سەرچاوەی گەرمی یان ئۆكساندن، لەدەستدانی گەرمی بەشێوەیەكی تدریجی ڕوودەدات بەهۆی كاریگەرییە فیزیاویەكان وەكو بەركەوتن(تماس) وگەیاندن و تیشكدان(اشعاع). ئەمەش دەبێتە هۆی یەكسان بوونی پلەی گەرمی لەش وپلەی گەرمی دەوروبەر، لەدەستدانی گەرمی لە بەشەكانی سەر ڕووی لەش و بەشە كراوەكان خێراتر ڕوودەدات وەك لە ئەندامەكانی ناودوە.

لە ناوهەوای فێنك نزیكەی ١٢ سەعات دوای مردن پلەی گەرمی ڕووی دەرەوەی لەش یەكسان دەبێت بە پلەی گەرمی دەوروبەر، بەڵام ئەندامەكانی ناوەوە پارێزگاری لە گەرمی خۆیان دەكەن بۆ ماوەیەكی درێژتر بەهۆی بوونی چەند چینێكی پێست، چەوری، ماسولكە ولینجە پەردە.. وە بە ماوەی ٢٤-٣٦ سەعات دوای مردن پلەی گەرمی ناوەوە(بەگەرمی پێوی ڕێكە_محرار شرجي) یەكسان دەبێت لەگەڵ هی دەوروبەر ئەمەش دەگۆڕێت بە ئاو وهەوا، جل وبەرگی(پۆشاكی بەری) وڕووبەری لەش.

گرنگیی لەدەستدانی گەرمی لە ڕووی پزیشكی دادوەریەوە:

١- نیشانەیەكی دڵنیاكەرەوەی مردن دادەنرێت ئەگەر پلەی گەرمیی لەش نزم بۆوە بۆ ٢٠ پلە.

٢- بۆ حساب كردنی كاتی تێپەڕبوو بەسەر مردن ئەمەش بەگوێرەی یاسای گلیستەرز كە دەڵێت: (كاتی تێپەڕبوو بەسەر مردن بە سەعات = ٣٧ - پلەی گەرمی مردووەكە / ١,٥).

پلەی گەرمی ڕووی دەرەوەی لەش بەنزیكەی ١٢ سەعات وە ئەندامەكانی ناوەوە بەنزیكەی ٢٤-٣٦سەعات وەك پلەی گەرمی هەوای دەوروبەر دەبێت

## پەڵەكانی مردن ؛-

بریتیە لە ڕەنگ گرتنی پێست بە ڕەنگێكی شین باو یان بنەوشەیی تۆخ ئەمەش لە بەشە نزمەكانی لەش ڕوودەدات لە ئەنجامی پڕبوونی بۆریلەكانی خوێن بە خوێن و ئەمەش لە ئەنجامی لە كار وەستانی دڵ وكاریگەری كێشی زەوی لەسەر خوێنی شل.

پەڵەی مردن دەست دەكەن بە دەركەوتن ١-٣ سەعات دوای مردن بەخاڵی ورد ئنجا گەورەدەبن ویەكدەگرن وپەڵەی گەورەتر پێكدەهێنن ویەكپارچە هەموو ڕووبەری نزمی لەش دادەپۆشی بێجگە لە جێگاكانی پاڵەپەستۆ(انضغاط) نێوان قورسایی لەش وزەوی وە ٨-١٢ سەعات دوای مردن جێگیر دەبێت وناگۆڕێ، بۆ نموونە ئەگەر تەرمەكە لەسەر پشت كەوتبێت هەموو پشت ڕەنگی شین دەبێت بێجگە لەو شوێنانەی كە پەستانیان خراوەتە سەر وەكو قورنج و كەلەكە و پشتی سەر كە

پەڵەی مردنیان تیادا دەرناکەوێت چونکە ئەو پەستانەی لە کێشی لەش پەیدا دەبێت ڕێ لە پڕبوونی مولوولەکانی خوێن دەگرێت.

گرنگیی پەڵەکانی مردن لەڕووی پزیشکی دادوەرییەوە:

١- دیاریکردنی کاتی تێپەڕبوو بەسەر مردندا ئەمەش بە تێبینی کردنی بڵاوبوونەوەی پەڵەکان. ئەگەر پەڵەکان زۆر لەیەک دووربوون ئەوە مانای ئەوەیە کە ١-٣ سەعات تێپەڕیوە بەسەر مردن، بەڵام ئەگەر پەڵەکان تەواو دروست بووبون ئەوا زیاتر لە ٨ سەعات تێپەڕیوە.

٢- بیرۆکەیەکمان دەداتێ لەبارەی هۆی مردنەکە ئەمەش بەهۆی ڕەنگ و شوێنی پەڵەکان بەم شێوەیەی خوارەوە:

❖ لە حالەتی خنکان: لێرەدا ڕەنگی پەڵەکان شینی تۆخە وەمەیلەو ڕەشە بەهۆی زیادبوونی ڕێژەی ئەو هیمۆگلۆبینەی کە پێی دەڵێن هیمۆگلۆبینی لێکراوە (Reduced Haemoglobin).

❖ لەکاتی ژەهرواي بوون بە گازی یەکە ئۆکسیدی کاربۆن ڕەنگی پەڵەکان سوورێکی پەمەیی (وردی) بریقەدار دەبێت ئەمەش بەهۆی زۆریی هیمۆگلۆبینی لێکراوە.

❖ لەحالەتی ژەهراوی بوون بە سیانید ڕەنگی سوورێکی تۆخە.

❖ لەکاتی مردن بەهۆی سەرما یان مانەوەی تەرمەکە لەناو سەلاجە ڕەنگەکە بنەوشەیی گەش دەبێت.

❖ لە حالەتی ژەهراوی بوون بەگازی ئەمۆنیا یان ($H_2S$) لەناوی بیرێکی جێهێڵراو ڕەنگی پەڵەکان شەکەری دەبێت.

١- لەکاتی مردن بەهۆی خوێن بەربوون ڕەنگی پەڵەکان شینی کاڵ دەبێت.

لەڕووی شوێنی پەڵەکانەوە:

❖ پەڵەکانی مردن لە ناوچەی سەر دەردەکەون لە تەرمی نقووم بوو چونکە سەر ڕەق وقوورسە بۆیە ژێر ئاو دەکەوێت.

❖ لەحالەتی لەسێدارەدان پەڵەکان لە خوارەوەی پەڵەکان(اسفل الأطراف) دەردەکەون.

شوێنی بەدەرکەوتنی پەڵەکانی مردن دەوەستێتە سەر چۆنیەتی دانانی تەرمەکە کاتێ کە خوێن هێشتا شلە واتە پێش ٨ سەعات دەگۆڕێت بەپێی گۆڕینی دانانی تەرمەکە، بەڵام پاش ٨-١٢ سەعات بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە ئەمەش بەهۆی مەیینی خوێن دوای ئەم ماوەیە.

## ڕەقبوونی مردن(الصمل الموتي)

بریتیە لە ڕەقبوونێك كە تووشی ماسوولكە خۆویست وخۆنەویستەكان دەبێت پاش تێپەڕبوونی ماوەی خاوبوونەوەی سەرەتایی لە ئەنجامی چەند كارلێكێكی كیمیاوی ئاڵۆز كە لە پرۆتینی ماسوولكەكان ڕوودەدات دەبێت، ماسوولكە بچووكەكان پێش گەورەكان ڕەقدەبن وەهەروەهایەكەم جار تووشی ماسوولكە خۆویستەكان دەبێت پاشان ماسوولكە خۆ نەویستەكان.

هۆی ڕوودانی ڕەقبوونی مردن:-

باودڕ وایە كە تێكچوون و نەمانی ئەنزیمی (ATPase) كە بەرپرسیارە لە گرژبوون و هەڵئاوسان [illegible] ی ماسوولكەكان، ئەم ئەنزیمە دوای مردن [illegible] دەشكێت و خۆنیەكانی لاكتین پێك دێت كە بەرپرسیارە لەم ڕەقبوونە، لە نیشانەكانی ڕوودانی ڕەقبوون لە تەرمەكەدا ئەوەیە كە چەند خاڵێك لەسەر پێست دەردەكەوێت كە بە پێستی قاز دەچێت ئەمەش بەهۆی گرژبوونی ئەو ماسوولكانەی كە پێیان دەڵێن ماسوولكەی چیكڵدانەی موەكان.

ئەو هۆكارانەی كاردەكەنە سەر دەركەوتنی ڕەقبوونی مردن:-

١- پلەی گەرمی: لە پلە گەرمیە بەرزەكاندا ئەم ڕەقبوونە زوو دەست پێدەكات و زووش كۆتایی دێت، بەڵام لە پلەی گەرمی سفری سەدی زۆر بە هێواشی و تأخیر دەردەكەوێت.

٢- تەمەن و قورسی‌یان بنچینەی لەش: لە منداڵ و پیر درەنگ دەردەكەوێت ودرەنگیش كۆتایی دێت ، بەڵام لەو كەسانەی كە ماسوولكەی بەهێزو گەورەیان هەیە زوو بەدەردەكەوێت و زووش كۆتایی پێدێت.

٣- هۆی مردنەكە: لەحالەتی ژەهراوی بوون بە ئەستریكنیت یان لە حالەتی كەشەنگ بوونی ماسوولكەكان هەروەكو لە (tetanus) ڕوودەدات. ئەم ڕەقبوونە بەشێوەیەكی خێراتر ڕوودەدات.

گرنگی ڕەقبوونی مردن لە ڕووی پزیشکی یادوەریەوە:-

١- دیاریکردنی کاتی تێپەڕبو بەسەر مردندا، ڕەقبوون ١-٣ سەعات دوای مردن دەستپێدەکات لە ماسوولکەی پێڵووەکانی چاو پاشان شەویلگەکان و پاشان ماسوولکەکانی مل و پەلەکانی سەرەوە و پاشان قەد کۆتایی پێ دێت بە ماسوولکەی قاچ، ١٢ سەعات دای مردن هەموو لەش ڕەق دەبێت وەك پارچە دارێك دەبێت وجومگەکان نانوشتێنەوە، وە ١٢ سەعاتیش بەردەوام دەبێت وە دوایی خاودەبێتەوە لە ماسولکەی پێلوو-دەست پێدەکات پاشانیش بەهەمان تەرتیبی پێشوو کۆتایی دێت لە ماوەی نزیکەی ١٢ سەعات.

٢- بیرۆکەیەکمان دەداتێ لەبارەی دانانی تەرمەکە لەکاتی مردندا، بۆ نموونە لەحاڵەتی لەسێدارەدان دەستی مردووەکە هەر بە بەرزکراوەیی دەمێنێتەوە.

٣- بیرۆکەیەکمان دەداتێ لەسەر هۆی مردن بۆ نموونە: ئەگەر مردوو دەستی لەدواوە بەسترابێت مانای ئەوەیە کە کوژراوە.

ئەو حاڵەتانەی کە بە دیاردەی ڕەقبوونی مردن دەچن:

١- گەشەنك بوونی مردن(التشنج الموتي_Cadaveric spasm): ئەمە لەکاتی یان لە چرکەی مردندا ڕوودەدات بەبێ ئەوەی بە حاڵەتی خاوبوونەوەی یەکەمی یان سەرتایی ماسوولکەکاندا بڕوات، بریتیە لە بەردەوامییەك لە چەند کەشەنگ بوونێکی زۆر بەهێز کە تێك چوون یان هەڵچوونێکی باری دەروونی بەهێزی لەگەڵدایە. ئەمەش تووشی ماسوولکە خۆویستەکان دەبێت تەنها، بە تایبەتی ماسوولکەکانی دەست هەروەکو لەحاڵەتی نقووم بوون یان خۆکووشتن ڕوودەدات.

٢- ڕەقبوون بەهۆی گەرمیەوە (مەیینی پرۆتینی_التخثر الزلال): تەرمەکە دەبێتە ڕەژوو لەئەنجامی ئاگرێکی بەتین وە مادە پرۆتینەکان لە ماسوولکەدا دەمەیێ بەمە ماسوولکەکان ڕەقدەبن بەبێ ئەوەی بە حاڵەتی خاوبوونەوەی یەکەمی یان سەرتایی ماسوولکەکاندا بڕوات، ڕیشاڵەکانی کورتدەبنەوە کە دەبێتە هۆی کورت بوونەوەیەك لە ماسوولکەکان، بۆیە هەموو جومگەکان دەچەمێنەوەو تەرمەکە لەشێوەی زۆرانبازێك دەچێت، وە لەوانەیە چەمانەوەیەکی جومگەکان یان دڕانی ماسوولکەکانی لەگەڵدا بێت. ماسوولکەکان تووشی ڕەقبوونی دوای مردن نابن بەڵکو هەر بە ڕەقبوویی دەمێنێتەوە تا بۆگەن نەبن.

٣- ڕەقبوون بەهۆی ساردیەوە(التجمد بالبرودة): ئەمەش لە تەرمدا ڕوو دەدات کاتێ لەشوێنێکی زۆر ساردبێت یان لەناو ساردکەرەوە(ثلاجة) کە دەبێتە هۆی بەستنی شلەکانی لەشی ورەقبوونی تەرمەکە، ئەم دیاردەیە نامێنێت بەدانانی تەرمەکە لە شوێنێکی گەرم کە شلەبەستووەکان خاودەبنەوە ودوایی ڕەقبوونی مردن(الصمل) دەستپێدەکات.

## بۆگەنبوون(التفسخ)

بریتیە لە دوا گۆڕانکاری لە تەرمدا ئەمەش بە گۆڕینی مادده ئەندامیەکان بۆ ماددەی نا ئەندامی بەهۆی کاری خۆشیکردنەوە(التحلل الذاتي) وگەشەی بەکتریا ومیکروب ومێرولەکان وخواردنی لەلایەن گیانلەوەرە جۆراوجۆرەکان، کە دەبنە هۆی شیبوونەوە ولەناوچوونی شانەکان بەشێوەیەکی تدریجی تەنها مانەوەی ئێسکەکان، بۆگەن بوون دەبێتە هۆی لەدەستدان و شێوان ونەمانی ڕوالەتەکانی تەرمەکە ودەرەوەدا لەناوچوونی برینەکان ولەدەستانی بەڵگەی بەرکەوتنی هێزی دەرەکی وبێکەڵکبوونی تەرمەکە لەڕووی پزیشکی دادوەرییەوە.

### هۆیەکانی بۆگەنبوون:

1. بەکتریا: چەند جۆرێکن گرنگترینیان بەکتریای ناهەوایییە کە لەریخۆڵەدا دەژی وە بەکتریای هەوایی کە لە ڕێڕەوەکانی هەناسەدا دەژی.

بەکتریا چەند ئەنزیمێکی شیکەرەوەی پرۆتین دەردەدات وەك(Lecithinase) کە بەکتریای (Welchii) دروستی دەکات کە دیواری خانەکانی لەش تێك دەشکێنێ لەوانەش دیواری خانەکانی خوێن. وە بەرپرسیارە لە شیبوونەوەی خوێن لە تەرمەکە. شیبوونەوەش دەبێتە هۆی درووست بوونی چەند گازێك لە هەموویان گرنگتر گازی ئەمۆنیا، $H_2S$، $CO$,$CO_2$، $CH_4$، $NH_3$.کە بۆنی بۆگەن پەیدادەکەن، خرۆکە سوورەکانی خوێن شیدەبنەوە و هیمۆگلۆبین دەردەچێت ویەك دەگرێت لەگەڵ ئەو گازانەی کە لە ئەنجامی بۆگەن بوونەوە دروست دەبن بە تایبەتی ($H_2S$) وە چەند پێکهاتەیەکی سەوزی تۆخ پێك دەهێنن کە لوولەکانی خوێن ڕەنگ دەکەن، وە ئەم ڕەنگەش یەکەم جار لەلای خوارەوەی دیواری سك دەردەکەوێ چونکە ئەم ناوچەیە ([illegible]) دەوڵەمەندە بە بەکتریا.

لەکەش وهەوای مام ناوەندی بۆگەن بوون ٢٤-٣٦ سەعات دوای مردن دەست پێدەکات وە لە هاوینیدا دوای ١٢ سەعات لەوانەیە دەستپێبکات، بەلام لە زستاندا لەوانەیە بۆ ٧٢ سەعات یان زیاتر دوابکەوێ. دوایی ئەم ڕەنگە وورده وورده بلاو دەبێتەوە لەدیواری سك لەرێگەی خوێنهێنەرەکانەوە، وە ئەم خوێنهێنەرانە ڕەنگ دەگرن وە شێوەی دارێکی بێگەلا بەخۆوە دەگرن دوایی ڕەنگەکە لە سنگ وپەلەکان وئەندامەکانی ناوەوە بلاو دەبێتەوە، ٣-٥ ڕۆژ دوای مردن لەئەنجامی پەیدابوونی گازێکی زۆر تەرمەکە بەگشتی هەلدەئاوسێ پەستانی ناوەوە زیادەکات وئەندامەکانی ناوەوە بۆ دەرەوە دەردەپەڕینێ ئەمەش دەبێت هۆی دەرپەڕینی چاوەکان(جحوظ العینین) و دەرپەڕینی زمان(بروز اللسان) و دەرچوونی کەفێك کە خوێناوییە لەدەم ولووت هەندێك جار. پیستی لە گۆم وتۆماو دەرچەی میز دەردەکەوێ، چەند بلقێك لەژێر پێست وناو ماسولکەکان دروست دەبێت کە شلەی تێدایە لەگەل گازی بۆن ناخۆش وە لە ٥-١٠ ڕۆژ ئەم بلقانە دەتەقن و پرچ هەلدەوەرێ ونینۆك دەکەوێ تەرمەکە دەشێوێت و ناتوانرێ بناسرێتەوە. بەرەبەرە ئەندامەکانی لەش دەرەوە وناوەوە شیدەبنەوە ولەناودەچن ودوای ٦ مانگ بۆ سالێك بەسەر مردن هەموو شانەکانە شلەکان(الانسجة الرخوة) لەناودەچن وتەنها ئێسك وبەستەرەکانی(العظام وأربطتها) دەمێنێتەوە، هەندێ ئەندام زووتر تووشی بۆگەنبوون دەبن لەوانی تر لەوانە مێشك پێش هەمووان بۆگەن دەبێت کەچی منداڵدان ویرۆستات دوا ئەندامن لە بۆگەنبوون، دوای ٣-٥ سال تەنها ئێسکە پەیکەر بەبێ بەستەرەکان دەمێننەوە کە سەرەتا زەردە بەرەبەرە سپی وسووك دەبێت و هیچ بۆنێکی لێ نایەت و لە جومگەکانیشەوە نەبەستراوە.

گرنگیی لە ڕووی پزیشکی دادوەریەوە: ((بۆگەنبوون))

١- لەوانەیە هۆکاری مردنەکە بزانرێت بەهۆی بوونی شکستێك لە ئێسك یان هەبوونی تەنی بێگانە وەکو بوونی گوللە وەهەروەها دەتوانرێ ژەهرە کانزاییەکان دەتوانرێ لەئێسك دەربهێنرێ.

٢- دیاریکردنی کاتی تێپەڕیو بەسەر مردندا.

ئەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر خێرایی بۆگەنبوون:

١- هەوا: ئاسان گەیشتنی هەوا بۆ تەرمەکە دەبێت هۆی زیادبوونی خێرایی بۆگەنبوون چونکە ئەم هەوایە بەکتریای هەلگرتووە، بۆ نموونە بوونی

تەرمەکە لە شوێنێ کراوەدا، بەڵام تەرمی نێژراو لە قوڵاییدا درەنگ بۆگەن دەبێت، بە گشتی تەرم لە هەوای دەرەوە دووئەوەندە خێراتر بۆگەن دەبێت وەك لە بوونی لەناو ئاو وچوارئەوەندە خێراتر لە بۆگەن دەبێت وەك لە بوونی لە ناو خاك بە نێژراوی.

٢- پلەی گەرمی: لە پلی گەرمیی ٣٠ - ٣٧ پلەی سەدی بۆگەنبوون زیاد دەکات بەهۆی زیادبوونی زۆربوون و گەشەی بەکتریا، بەڵام لە پلەی گەرمیی ٤٥ - ٥٠ وسەرەوە بۆگەنبوون رادەوەستێت وە پرۆسەی بە مۆمیابوون دەست پێدەکات، وە لەخوار پلەی ١٠ بۆگەنبوون سستدەبێت ولە پلەی گەرمی سفری سەدی رەقبوونی سەرما دەست پێدەکات.

٣- رادەی شێ: یەکێکە لە هۆکارە یاریدەدەرەکانی بۆ گەشەی بەکتریا، هەر لەبەر ئەوەشە یەکەم نیشانەی بۆگەنبوون لە ناوچەی ریخۆڵە کوێرە روودەدات. هەروەها ئەو تەرمانەی کە نێژراون لە شوێنی شێداردا زووتر بۆگەن دەبن. وە تێبینی دەکرێت کە تەرمی نقووم بووێك پاش دەرهێنانی لە ئاو زووتر بۆگەن بێت لەو تەرمەی کە لە جێگاکەی ووشکە.

٤- هۆکاری مردن: هەوکردنی میکرۆبی خێرایی بۆگەنبوون زیاد دەکات، کەچی هێواش دەبێت لە مردن بەژەهراویبوون بە کانزاقورسەکان.

٥- تەمەن و قەبارەی لەش: بۆگەنبوون دوا دەکەوێت لە مندال و تازە لەدایك بووەکان بەڵام خێرا روودەدات لە لەشە گەنجەکان.

## بە شەمیٚ بوون (التشمع الموتي)

روودەدات بە گۆڕانی لەش لە رووخسارێکی چەوری تەری ئاسا بۆ ماددەیەك کە باش رەق بووبێت. ئەمەش دەبێتە هۆی وەستانی بۆگەنبوون وتەرمەکە پارێزگاری لە رووخساری خۆی دەکات.

لەژێر چەند بارودۆخێکی دیاریکراودا شانە چەوریەکان دەگۆڕێن بۆ شانەی رەق کە بۆنێکی لیٚ دێت پێی دەڵێن (رائحة زنخة) وە بە رەنگێکی سپی مەیلەو زەرد، بەهۆی شیبوونەوەی ئاوی وبەهایدرۆجین کردن(الهدرجة)، ئەمە روودەدات کاتیٚ تەرمەکە لەناو ئاو نقووم بووبێت بۆ ماوەیەك کە کەمتر نەبێت لە ٣ هەفتە وە بە ماوەی ٦ مانگ بۆ ساڵێك بەتەواوی بەشەمیٚبوون دەبێت.

گرنگیی دادوەری:

١- ناسینەوەی کەسێتی: چونکە تەرمەکە پارێزگاری لە رووخساری خۆی دەکات و بۆگەنبوون رووناداو بە ئاسانی دەناسرێتەوە.

٢- دیاریکردنی کاتی تێپەربوو بەسەر مردن: بەشەمیٚ بوون ووردە ووردە لەو شانانە روودەدات کە چەوریان تیایە وەکو دیواری سك، سنگ، مەمك لە ئافرەت. بەشەمیٚ بوون لە سنگدا پاش ٣ هەفتە لە بوونی لە ئاوەوە بەشەمیٚ بوون لە سنگدا تەواو روودەدات پاش ٣ مانگ وە لە هەموو لەشدا روودەدات لە ماوەی ٦ مانگ بۆ سالێك.

٣- زانینی هۆکاری مردن: ئەمەش بەهۆی مانەوەی نیشانەی زەبری دەرەکی وەك برینی تەعنی یان قەتعی یان برینی چەکی ئاگرین.

٤- بوونی ئەم گۆرانکاریە ئەوە دەگەینیٚ کە تەرمەکە لە شوێنێکی ئاوی وشێداربووە.

## بەمۆمیابوون (التحنط)

روودەدات کاتیٚ تەرم لە شوێنی ووشك وگەرم (٥٠ پلەی سەدی یان زیاتر) دا بمێنێتەوە وەك مانەوەی تەرم لە بیاباندا کاتێك کە بەهۆی گەرمی شلەکانی لەش دەبن بە هەلم و لم بەشێکی هەڵدەمژێت و تەرمەکە ووشك دەبێتەوەو بۆگەن نابێت وتەرمەکە ٣/٤ی بارستاییەکەی لەدەست دەدات و پێستی رەق دەبێت. وشێوەی کەسەکە وەك خۆی دەمێنێتەوە ئەمەش دەتوانریٚ بەشێوەیەکی دەستکرد رووبدات بەهۆی ماددەی فۆرمالین یان وەکو لە سەردەمی فیرعەونەکان ئەویش بە لابردنی ئەندامەکانی ناوەوەو سواخ دانی دیواری ناوەوی سك بە ماددەی قیر.

گرنگیی لە رووی پزیشکی دادوەریەوە:

١- ناسینەوەی تەرمەکە چونکە پارێزگاری لە رووخساری دەرەوەی خۆی دەکات.

٢- شوێنەواری بەرکەوتنی هێزی دەرەکی دەناسرێتەوە بەوە هۆی مردن دەزانرێت.

٣- دیاریکردنی کاتی مردن.

٤- ئەوە ددگەنێت کە تەرمەکە لەشوێنێکی ووشك وگەرم بووە.

# برین (الجرح_الجروح) Wounds

د.شێروان احمد گەرۆتە

**برین:** بریتی یە لە پچرانێک (درانێک) لە شانەکانی لەش یان بریتی یە لە جیابوونەوە وەپچرانی شانەکانی لەش، ئەمەش لەئەنجامی بەرکەوتنێکی (کارتێکەرێکی) دەرەکی یەوە روو دەدات یان لەئەنجامی بەکارهێنانی (تطبیق)ی هێزێك روو دەدات، ئەم پچرانە بە شێوەیەکی دیار دەبینرێ لەسەر پێست و ناوپۆشە لینجەکان (الاغشیة المخاطیة) (mucous membrane)، بەلام بەشێوەیەکی نادیار (غیر ظاهر) دەبێت لە ماسولکە و دەمار و ئێسك و کرکراگەکان (cartilage).

لەپێست پێی دەوترێ برین (الجرح)، لە ناوپۆشە لینجەکان پێی دەووترێ شەقبوون (تشقق)، لەماسولکە پێی دەگوترێ پچران (تمزق – tear)، لەشانە شلەکان (الانسجة الرخوة) و ئەندامەکانی ناوەوەی لەش پێی دەلێن تورخانەوە (تهتك)، لەئێسك و کرکراگە پێی دەلێن شکان (کسر – Fracture).

جۆرەکانی برینداربوون دەوەستێتە سەر (انواع الجروح یتوقف علی):

١- جۆری ئەو ئامێرەی کە بەکارهێنراوە: بۆ نموونە، ئامێری تیژ (حاد) وەك چەقۆ، خەنجەر، موس، شووشە....ئەم ئامێرانە ئەگەر بە ستوونی بەر لەش بکەوێت ئەوا (جرح طعني) دروست دەکات، ئەگەر بە پانی (افقی) بەرکەوێت ئەوا (جرح قطعي) دروست دەکات وە ئەگەر تەنها لە پێست بخشێت ئەوا داڕووشان (جرح سحجي) دروست دەکات، ،ئامێری پان یان کوڕ (راضة) وەك مست، بەرد، دار، ئۆتۆمبێل، زەوی...... ئەم ئامێرانە گۆوان دروست دەکەن ئەگەر بەر لەش بکەون بەلام ئەگەر بە لەش بخشێ ئەوا داڕووشان دروست دەکەن، ئامێری نووك تیژ (مدببة) وەك دەرنافیس، قەلەم، شیشی تکە.... برینی تێراچوون (جروح وخزیة – واخزة) دروست دەکەن.

٢- هێزی بەکارهاتوو بۆ جوولانی ئامێرەکە: دەست، ئۆتۆمبێلی جوولاو، چەکی ئاگرین (سلاح ناري)، ئامێری خێرا، بۆ نموونە ئەگەر گوللە بە دەست بهاوێژرێ

ئەوا تەنها داڕووشان یان گۆوانێکی بچووک دروست دەکات کەچی ئەگەر بە جەکێ ئاگرین بهاویشتری ئەوا کونێك لە پێست و زیانیتر لە ناو لەش پەیدا دەکات واتە جۆری برین دەگۆڕێ.

٣- جۆری شانەی بریندار کراو: برینداربوونی شانە شلەکان(جەرگ، مێشك...) ئاسانتر بریندار دەبێت لە ماسولکە و ئێسك ئەگەر هەمان هێز بەکاربێت، بە گشتی پێست لە شانەکانیتر زیاتر بەرگەی هێزی ئامرازی پان دەگرێت، لەوانەیە بە بەرکەوتنێك ئێسك بشکێت بەڵام پێستەکە بریندار نەبێت، یان لەوانەیە لێدانی مستێکی بەهێز لە سك ببێتە خوێن بەربوون لە جەرگ یان سپڵ کەچی پێستەکە هەر ساغ بێت.

## جۆرەکانی برین(انواع الجروح):

بەپێی ئەوهۆکارانەی سەرەوە برینەکان دەکرێن بە:-

١- بەرکەوتنە کوێرەکان(ئامێری پان یان کوێر بەکارهاتووە_ الاصابات الرضية من استعمال الات راضة):-

ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:-

أ- داڕووشان (السحج – Abrasion)

ب- گۆوان( الكدم – الرض – Bruise)

ج- برینی کوێر (الجرح الرضي – Contused Wound)

٢- برینە تیژەکان (الجروح الحادة):ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:-

أ- برینی بڕین (الجرح القطعي – Incised Wound)

ب- برینی طعن ( الجرح الطعني – Stab Wound)

ج- برینی تێڕاچوون( الجرح الوخزي – Punctured Wound)

د- برینی گوللە (الجرح الناري – Bullet Injury)

گرنگی برینداربوون لە ڕووی پزیشکی دادوەری یەوە (الاهمية الطبية العدلية للجروح):-

ڕوون دەبێتەوە لەجۆری برینەکە، شوێنی برینەکە، ژمارەی برینەکان، بڕی تێکچوون( damage)، قوڵایی برینەکە، درێژی برینکە، یان بزانین ئایا بە ڕێکەوت

بووە(عرضية)، یان خۆ بریندارکردن بووە (انتحارية) یان تاوانکاری بووە (جنائی) یان بزانین ئایا بەزیندوویی بریندارکراوە یان بە مردوویی(حیوية او غیر حیوية).

## جۆری برینەکان بە پێی دەرەنجامەکانی(انواع الجروح بالنسبة لنتائجها الحياتية):-

١- برینی سادە:- ئەمەیان بە ماوەیەك چاك دەبێتەوە کە زیاتر نیە لە بیست رۆژ(عشرين يوما) هیچ ماکێك یان شێواندنێك (تشوه) بەجێ نلهێلێت دوای چاك بوونەوە.

٢- برینی ترسناك (خطيرة): ئەمەیان پێویستی بەزیاتر لە بیست رۆژ هەیە بۆ ئەوەی چاك بێتەوە، بەلام پاش چاك بوونەوە عەیبێکی درێژخایەن(عيب مستديم ) بەجێ دەهێلێت (لەکار کەوتنێك "عطل" یان شێواندنێك "تشوه").

٣- برینی کوشندە(مرێنەر – مميتة): ئەمەیان دەبێتە هۆی مردنی کەسەکە بەهۆی بەرکەوتنەکە بە ماوەیەکی کەم( بۆ نموونە خەنجەر لە دل یان لێدانی گوللە لە سەر) یان پاش ماوەیەك لە بەرکەوتنەکە بەهۆی ماکەکانی برینەکە (مضاعفات الجرح).

## داڕووشان (السحج – *Abrasion*)

بریتی یە لە تێك چوونی یان لەدەست داتی بەشی دەرەوی پێست (یان توێژی پێست) ئەوەش لەئەنجامی لێك خشانی پێست لەگەل ئامرازێکی یان شتێکی یانی دڕ وەکو زەوی یان بەهەر ئامێرێك تیژ یان نووك تیژ کە پێست دادەڕووشێنێ وەکو نینۆك، ددان، چەقۆ، دەرنافیس.... ئەم داڕووشانەش خوێن بەربوونی کەمە، وە چاك دەبێتەوە بێ ماك دروستکردن.

جۆری داڕووشان (داڕووشان) دەوەستێتە سەر چۆنێتی ڕوودانی ١- بۆ نموونە کاتێك کە ئامێرەکە بەشێوەیەکی ستوونی بێت لەسەر پێست پێی دەلێن ( السحج الطبعي – Impact Abrasion)، بەلام لە (السحج الكشطي ) ئامێرەکە بەشێوەیەکی لار لەسەر پێست دەجولێنرێ بۆ مسافەیەکی دیاری کراو، بۆ نموونە جنجرۆك بەنینۆك لەسەر پێست وە چەند هێلێکی تەریبی شێوە مانگ (هلالی متوازی) پێك

دەگەیەنێت. ٣- بەڵام لەکاتی لێک خشانی پێست لەگەڵ جسمێکی دڕ وەکو زەوی، ئەوا داڕووشانی لێک خشاندن دروست دەبێت (Friction Abrasion) وە زۆربەی ئەو داڕووشانی لێک خشاندنانە شێوەیان هێلکەیی یە.

گرنگی داڕووشان لەڕووی پزیشکی دادوەریەوە:-

(الاهمية الطبية العدلية للسحج):-

١- بۆ زانینی جۆری چەکەکە(یان ئامێرە بەکارهێنراوەکە)؛ ئەمەش بەهۆی شێوەی داڕووشانەکە، بۆ نموونە داڕووشانی کشطی (کەبەهۆی جنجرۆک لێدان بە نینۆک دروست دەبێت) شێوەی داڕووشانکە وەکو شێوەی مانگ(هلالی) دەبێت و هێڵەکان هاوتەریبن، دەست پێ دەکات بە فراوانبوون کۆتایی دێت بە تەسک بوونەوە و وەکو ئاراستەی جوڵەی ئامێرەکەیە.

٢- دیاریکردنی تەمەنی(کاتی) بەر کەوتنەکە ئەمەش بەهۆی زانینی تەمەنی داڕووشانکە بەم شێوەیە: لەچەند دەقەی یەکەم شوێنی داڕووشاوەکە سوور دەبێت وخویناوی لێدێ(مصل)، پاشان قەتماغێکی سووری تەڕ دروست دەبێت لە چەند سەعاتێکی یەکەم دوای ڕوودانی داڕووشانکە، دوایی ووشک دەبێتەوە قەتماغەیەکی ڕەش دروست دەبێت لە ماوەی دوو یان سێ ڕۆژ، ئنجا قەتماغەکە دەست دەکات بە جیابوونەوە لەپێست، ئەم جیابوونەوەیەش لە لێواری قەتماغەکەوە دەست پێ دەکات بەرەو ناوەڕاست، پاشان قەتماغەکە بە تەواوی لێدەبێتەوە بەماوەی نزیکەی یەك هەفتە.

پاش لێبوونەوەی قەتماغەکە شوێنێکی سوور بەجێ دەمێنێ، پاش نزیکەی دوو هەفتە شوێنەکە ڕەنگی ئاسایی پێست وەردەگرێتەوە ئەمەش بەلەبەر چاوگرتنی توانا و شوێنی داڕووشانکە و ڕوودانی هەوکردن تیایدا(حدوث الالتهابات).

٣- بیرۆکەیەکمان دەداتێ لەبارەی جۆری تاوانەکە کە ئەمەش بەهۆی شوێنی داڕووشانکەوە بەم شێوەی خوارەوە: داڕووشانکە دەوروپشتی لووت و دەم ئەوە دەگەیەنێت کە هەناسەبڕ (کتم النفس) کراوە واتە، بەڵام داڕووشانی نینۆك کە لە هەردوو لا مل بێ مانای خنکاندن بەدەست دەگەیەنێ، داڕووشانی بازنەیی لە دەوری مل واتە خنکاندن بەهۆی پەتێکەوە، بەڵام داڕووشان لە ئەندامی زاوزێی مێینە مانای دەست درێژی سێکسی دەگەیەنێ واتە (اغتصاب)، بوونی داڕووشان لە مەچەك و باسك (المعصم والرسغ) نیشانەی بەرگری کردنە(مقاومە).

## گۆوان _شین و مۆر بوون(الكدم – Echymosis – Bruise)

بریتیه له کۆبوونەوەی خوێن له شانەی بن پێست (subcutaneous tissue) یان شانه قووڵەکان بەهۆی تەقینی یان پچڕانی لوولەی خوێنەوە دەبێت له ئەنجامی بەرکەوتنێك بە ئامێرێکی کوڕ( یان – الة راضة) وەکو گۆچان، بەرد، مشت، لێدانی ئۆتۆمبێل (الدهس) یان کەوتن له شوێنێکی بەرز.

خێرایی بڵاوبوونەوەی گۆوان دەوەستێتە سەر(سرعة ظهور الكدم وانتشارها يتوقف على):-

١- هێزی بەکارهاتوو(القوة المسلطة).

٢- جۆری ئامێرە بەکارهێنراو.

٣- جۆری ئەو شانەیەی کە تووشی بەرکەوتنەکە بوون بۆ نموونە:- گۆوان زووتر دەر دەکەوێت و پانتاییەکی فراوانتریش داگیر دەکات ئەگەر هاتوو لە شانە شل و خاوەکان وەکو شانەی چەوری ڕوو بدات.

٤- کاریگەری هەندێ باری نەخۆشی/ بۆ نموونە لە هەندێ نەخۆشی خوێنی وەکو لیوخیمیا وهیمۆفیلیا گۆوانێکی زۆر گەورە بە هێزێکی کەم دروست دەبێت.

گۆوانی ڕووپۆشی پێست لە شوێنی بەرکەوتنی هێزە ڕاستەوخۆکە دەردەکەوێت،- لەوانەشە بۆ دەرکەوتنی پێویستی بە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ هەبێت ئەگەر دڕان (لێك پچڕان) لەشوێنە قووڵەکانی لەش دا ڕوویدا، لەوانەشە گۆوان لە شوێنی بەرکەوتنەکە بەدەر نەکەوێت وەك ئەو بەرکەوتنی هێز بە نێوچەوان دەبێتە هۆی شین بوونی دەورووبەری چاو، لەوانەیە پاش ماوەیەك شوێنەواری بەرکەوتنەکە بەدەربکەوێت بە شێوەی خوێن بەربوونێك کەلە ناوچەی چاو (محجر العين) ڕوودەدات ئەمەش بەهۆی خزانی خوێن بۆ شانە شل و خاوەکانی ئەم ناوچەیە بەهۆی هێزی کێش کردنی زەوی یەوە.

گرنگی گۆوان لەڕووی دادوەری یەوە( الاهمیة المدنیة الكدم):-

١- ناسینەوەی یان زانینی جۆری ئەو چەکەی یان ئەو ئامێرەی کە بەکارهاتووە ئەمەش بە سەیرکردنی شێوە(شکل)ی کە دەمەکە

٢- زانینی جۆری تاوانەکە ئەمەش بەهۆی سەیرکردنی شوێنی گۆوانەکە، بۆ نموونە گۆوانی سەر مەچەك و باسك (الرسغ- المعصم) نیشانەی بوونی بەرگری یە(مقاومە.

٣- دیاریکردنی کاتی بەرکەوتنەکە/ ئەمەش بەهۆی زانینی تەمەنی گۆوانەکەوە: ئەمەش دەوەستێتە سەر ئەو گۆڕانکاری یانەی کەبەسەر ڕەنگی گۆواندا دێت لە ئەنجامی شی بوونەوەی خوێن، لێرە لە دەقیقەکانی یەکەم دوای گۆوان ڕەنگەکە سوورە دوایی شین دەبێت، دواتریش زەرد دەبێت وەهەر گۆڕانێکیش لەم ڕەنگانە پێویستی بە (٢-٣) ڕۆژ هەیە، پاش هەفتەیەك پێست ڕەنگی سروشتی خۆی وەردەگرێتەوە، گۆڕانی ڕەنگیش لە دەورووپشتی گۆوانەوە دەست پێ دەکات بەرەو چەق.

٤- گۆوان هەمیشە کردارێکی زیندووە/ واتە گۆوان لە دوای مردن ڕوونادات، پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان گۆوان لەکاتی پشکنینی مردوو لەگەڵ پەڵەکانی مردن( خڕ بوونەوەی خوێن - الانحدار- البقع الموتیە) ئەمەش بۆ سەلماندنی زیندوویی حاڵەتەکە( حیویة الحالة).

٥-گۆوان لەوانەیە لەناو ماسولکەکان دروست بێت بەڵام لەڕووی پێست دیارنەبێت وەك لەڕان.

٦-مەرج نیە گۆوانی گەورە لە ئەنجامی بەرکەوتنی هێزێکی گەورەبێت/ لەوانەیە هێزێکی بچووك گۆوانی گەورە دروست بکات لە نەخۆشی هیمۆفیلیا.

٧-گۆوان تا ماوەیەکی زۆر لە پەیدابوونی بۆگەنبوون دەمێنێتەوە.

جیاوازی و لێك جیاکردنەوەی گۆوان و پەڵەکانی خوێن( الانحدار الدموي):
التمییزبین الكدم والانحدار الدموي:-

| ژ | گۆوان | پەڵەکانی مردن |
|---|---|---|
| -١ | لەوانەیە لەهەر شوێنێکی لەش ڕوو بدات وە بە ڕووبەری بچووك و دیاری کراو (صغیرە محدودە) یان | لەشوێنە نزمەکانی لەش ڕوودەدات بەڕووبەری گەورە بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| | سنوردار / [illegible] | پەڵەکانی [illegible] |
| ٢- | لەئاستی ڕووی لەش بەرزترە. | لەگەڵ ئاستی ڕووی لەشە. |
| ٣- | ڕەنگی گۆوان دەگۆڕێت بەگوێرەی لەگەڵ کات. | ڕەنگی پەڵەکانی مردن ناگۆڕێت بە تێپەڕبوونی کات تا بۆگەن بوونی تەرمەکە. |
| ٤- | لەکاتی تەشریح کردنی تەرمەکە دەبینین خوێن دزەی کردووە بۆ ناو شانەکان(تخلل في الانسجة). | خوێن لەناو موولولولە خوێنەکان کۆ دەبێتەوە لە بەشەکانی خوارەوەی لەش وە لەناو موولوولەکان دەرناچێت. |

## برینی کوڕ (جرح رضي Contused)

ئەمە ڕوودەدات لە ئەنجامی بەرکەوتن ولێخشاندنی ئامێرێکی کوڕ(یان)ی قورس وەك کەوتن لەبەرزایی یان لە حاڵەتی بەرکەوتنی ئۆتۆمبێل( الدهس) ڕوو دەدات.

تایبەتمەندی‌یەکانی برینی کوڕ( مميزات الجروح الرضية):-

١- لێوارەکان ڕێك ڕێك نەدڕاوە، کوڕنەکان(زاویە) تیژنین.

٢- هەبوونی گۆوان وداڕووشان لە لێوارەکان.

٣- لێك جیا نەبوونەوەی لێوارەکان بەتەواوی چونکە هیچ کەرت کردنێك (قطع) لەشانەکان بە شێوەیەکی تەواو ڕوونەداوە، ئەمەش چونکە بەشێك لە فایبەرەکان (ڕیشاڵەکان – Fibers) لێوارەکان بەیەکەوە دەگەیەنن و بنکەی برینکەش یەکسان نیە لە قولایی.

٤- خوێن بەربوونێکی کەم تێبینی دەکرێت چونکە لوولەکانی خوێن جۆرە پەستانێکیان کەوتۆتە سەر(پانبوونەتەوە) تەنها لە حاڵەتێك نەبێت ئەگەر برینەکە تووشی لوولە خوێنەکان بوو، ئەوا خوێن بەربوونەکە لەوانەیە زۆر بێت.

٥- تاڵە مووەکان پانبوونەتەوە شێوەیەکی ناڕێك وەنەبڕاون.

٦- بوونی تەنی(شتی) نامۆ یان غەریب لە برینەکەدا وەکو خۆڵ و پارچە قووماش و موو.

| | | |
|---|---|---|
| ٣- | برینەکە لە بەشی پێشەوەی مل تێبینی دەکرێ وە ئەم برینەش قووڵە لەسەرەتادا بەڵام ڕووکەش دەبێت، لە ژێر نەرمایی گوێ(صیوان الاذن)دەست پێدەکات بە ئاراستەیەکی لار بۆ خوارەوە. | برینەکە بە شێوەی ئاسۆیی و پانی دەبێت(افقی و مستعرض) هەمان قوڵایی دەبێت لەسەرەتا و لە کۆتاییدا. |
| ٤- | لەوانەیە دیاردەی گەشەنگ بوونی مردن هەبێت(التشنج الموتی). | نیە. |
| ٥- | لەوانەیە چەند برینێکی ڕووکەش تەریبی برینە قووڵەکە هبێت(برینی دوودڵی-جروح ترددیة). | نیە( لاتوجد جروح ترددیە). |
| ٦- | هیچ شوێنەواری بەرگریکردن( مقاومە) نیە. | لەوانەیە برینی بەرگری لە خۆکردن هەبێت وە داڕووشان و گوشان وبرینی تیژ و دڕانی جلووبەرگ. |



## برینی بەرگری لەخۆکردن (جروح دفاعية – Defensive wounds:-=

یەکێکە لە برینە ناسراوەکان، تێبینی دەکرێ، لەناو لەپی دەستی مردووەکە لە ئەنجامی بەدەستەوە گرتنی چەق یان لەئەنجامی بەرگری لەخۆکردن، ئەگەر دوو برینی هاوتەریب لەناو لە پی دەست دا هەبوون یان لە بەشی ناوەوەی پەنجەکان هەبوون ئەوە مانای وایە چەکەکە دوو لای تیژی هەبووە وەك خەنجەر، بەڵام یەك برین هەبوو ئەوە مانای وایە چەکەکە یان ئامێرەکە یەك لای تیژبووە وەك چەقۆ، وەهەروەها لەوانەیە برینی تیژ لە مەچەك وباسك ببینرێ کاتێ تاوانلێکراو دەستی یان مەچەکی داوەتەبەر بۆ خۆپاراستن.

## برینی دوودڵی (الجروح الترددية)

برتیە لە چەند برینێکی تیژی ڕووکەش کە تەریبە یان تێکەڵە لەگەڵ ئەو برینە قووڵە کە کەسی خۆکوژ لە لەشی خۆی دەکات ودەبێتە هۆی مردنی، ئەمەش لە ئەنجامی چەندجار دوودڵی وپەشیمانبوونەوە پەیدادەبێت پێش دروستکردنی برینە

قوڵە کوشتەدەکە، بوونی ئەم برینانە خۆکوژی دەگەیەنێت بەڵام لەهەموو حالەتێکی خۆکوژی نیە.

## برینی طعنة(الجرح القطعي – stab wound)

برینی طعنی لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئامێرێکی یەك لا تیژ یان هەردوولا تیژ ڕوودەدات وەکو چەقۆ و خەنجەر، ئەمەش بە پاڵ نانی ئامێرەکە بۆ ناوەوەی لەش بەشێوەیەکی ستوونی، لەزۆربەی کاتەکاندا ئەم جۆرە برینە تاوانکاریە(جنائیە)، بەدەگمەن دەبینین کە ئەم جۆرە برینە برینی خۆکوژی یان بەڕێکەوت بێت(عرضي).

تایبەتمەندیەکانی (ممیزاتها):-

١- قوڵایی برینەکە زیاترە لە درێژیەکەی لەوانەیە قوڵایی برینەکە بەقەد درێژی چەکەکە یان ئامێرەکە بێت ئەمە ئەگەر بەتەواوی پاڵی پێوەنابێت بۆ ناو لەش، یان هەندێ جار درێژتریش دەبێت لە درێژی چەکەکە ئەگەر پەستانی خستبێتەسەر ئامێرەکە ( دفع کردندا)بەتایبەتی لە لێدانی سك.

یان لەوانەیە قووڵایی برینەکە کەمتر بێت لە درێژی ئامرازەکە ئەگەر بەناتەواوی پاڵی پێوەنەنابێت.

٢- لێواری برینەکە ڕاستە وڕێکە(مستقیم) و زاویەکان (کۆرنەکان)هەردوولا تیژن وشێوەی برینەکە تەشیلەیی(مغزلی) دەبێت ئەگەر ئامرازەکە هەردوولای تیژ بێت (آلة حادة ذو حدين)بەڵام ئەگەر ئامرازەکە یەك لای تیژبێت یەکێك لە زاویەکان تیژ دەبێت و ئەودیتر تیژنابێت.

٣-خوێن بەربوونێکی بەکجار زۆری لەگەڵایە بەتایبەتی ئەگەر گەیشتبێتە ئەندامەکانی ناوەوەو (Viscera) لووله خوێنە گەورەکان بەرکەوتبن یان ئەندامی وەکو سی و دڵ و جەرگ و فاتەڕەشە (سپڵ) بەرکەوتبن.

٤- ئەگەر ئامێرەکە جووڵاندرابێ لەناو لەش یان سووڕاندرابێ لەناو لەش ئەوە برینی طعنتکە چەند برینێکی تری لەگەڵا دەبێت کە لە ئەندامەکانی ناودوە ڕوودەدات.

## برینی کۆری کەرت بوون(جرح رضي قطعي) (Contused – Incised Wounds)

- ڕوو دەدات لەئەنجامی بەکارهێنانی ئامێری قورس کە لێوارێکی تارادەیەك(نسبیا) تیژی هەبێت وەکو بیور (الساطور) تەورداس(الفاس)، لێوارەکانی برینەکە ڕێك وپێك و دارووشان (سحج) و بەگۆوان (تکدم)ێکی لەگەڵایە وە فایبەرەکان براون بە برینێکی تیژ. زۆربەی ئەم برینانە برینی تاوان کارین (جنائی) وە بەدەگمەن برینی بەرێکەوت دەبن وەهەرگیز برینی خۆ کوژی نین.

## برینی کون بوون(تێراچوون) الجرح الوخزی (Punctured Wound)

ڕوودەدات لەئەنجامی بەکارهێنانی ئامرازی باریکی نووك تیژ (مدببە) وەکو بزمار، دەرنەفیس..... وەشێوەی برینەکە بەپێی جۆری ئامێرەکە بەکارهێنراوەکەو مقطعەکەی دەگۆڕێت، لەوانەیە شێوەی سێگۆشەیی وەرگرێت یان شێوەی لاکێشە (...گیل) یان شێوەی ئەستێرە(نجمی) وەردەگرێت.

برینی تێراچوون نابێتە هۆی لەدەست دانی هیچ شانەیەك مەگەر بەر ئێسك بکەوێت، وەترسناکی ئەم جۆرە برینە لەوەدایە برینەکە لە دەرەوە زۆر بچووکە کە لەوانەیە نەبینرێ یان پشتگوێ بخرێ کەچی ئەندامەکانی ناوەوەی برینداركردبێت وببێتە هۆی خوێن بەربوونێکی زۆر یان پیس بوونی برین.

## برینی دروستکراو بەئەنقەست (الجروح المفتعلة) Fabricated wound

ئەو برینانەن کە کەسەکە خۆی دروستیان دەکات لەلەشی خۆی بۆ هەڵاتن لەواجبێك کە خراوەتە سەر شانی یان بۆ ئەوەی وابپێشان بدات کە بەرگری لە خۆکرووە یان بۆ تێوەگلاندنی (اتهام) کەسێکی تریان بۆ ناوبانگ دەرکردن(شهرة). برینەکەش بەشێوەی چەند برینێکی رووکەش(رووتەخت - superficial) دەبێت ئەگەر ئامرازێکی تیژی بەکارهێنابێت لەشوێنێکی بێ ترس (اماکن امنة) دەدات وەکو پەلەکان بەتایبەتی لاق وباسك، وە لە سنووری دەستی دەبێت(فی متناول الید).

لەوانەیە هیچ دڕانێک لە جل و بەرگی کەسەکەدا نەبێت یان ئەگەر هەشبێت ئەوا شوێنی دڕانەکان لە جل و بەرگی لەگەڵ برینەکان تێکنەکانەوە(لایتطابق موقع الجرح وموقع القطع في الالبسة).

## برینی نازیندەگی(جروح غیرحیویة – Post mortem wound)

ئەم جۆرە برینانە لەئەنجامی ڕاکێشانی تەرمی مردووەکە لەسەر زەوی یان لەسەر شتێکی دڕ یان بەهۆی تێوەگلان و دەستکاری ئاژەڵ یان هەتك کردنی تەرمەکە بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە ڕوودەدەن وە ئەمسیفاتانەی لای خوارەوەی هەیە:

١– هیچ نیشانە کارلێکە زیندەگیەکان نابینرێت وەکو سووربوونەوە یان ئەستووربوون(تورم) لە لێوارەکانی برینەکە یان خوێن بەربوون یان نیشانەی چاك بوونەوە.

٢– لێوارەکان لێك نزیکن وە ڕووتەختن وە ئەگەر مەیینی خوێن هەبێت ئەوا دزەکردنی خوێن نیە بۆ شانەکە، وە بەسڕینەوەیەك یان دەست پیاهێنانێك بە ئاسانی دەڕوات و نامێنێ.

٣– لەوانەیە هەندێك نیشانەی زیندەگی ڕووبدەن(علامات حیویة) ئەمە ئەگەر برینەکە ڕاستەوخۆ دوای مردن ڕوویدابێت.

## برینداربوون بە چەکی ئاگرین( جروح الاسلحة الناریة–Firearm)

ئەو برینانەن کە هاوێشتراوی کانزایی (مقذوفات معدنیة) دروستی دەکات بەهۆی هێزی ئەو غازەی کە لەئەنجامی سووتانی بارودەوە دەردەپەڕێت لە چەکی تایبەت بۆ ئەم مەبەستە.

پێکهاتەی چەکی ئاگرین( ترکیب السرح الناری – دەمانچەو کلانشکۆف....هتد)

١- لوولە:- بریتی یە لە کەناڵێکی کانزایی کە لە لای پێشەوە دەمێکی هەیە، لە لای پشتەوەش فەتحەیەك هەیە کە لەوێوە گوللەکە دەخزێت، وە بەگوێرەی درێژی ئەم لوولەیە دوو جۆر چەك هەیە: چەکی لوولە درێژ و چەکی لوولە کورت.

لوولە دوو جۆری هەیە:

لوولپێچی(محلزنە): چەند کەندۆلکەیەکی پێچاو پێچ لە ڕووی ناوەوەی لوولەکەدا هەیە کە بە ئاراستەی ڕاست و چەپ ڕێك خراون و ژمارەیان(٤-٧) پێچە هەروەکو لە چەکی حەربی و دەمانچەدا تێبینی دەکرێت.

لوولەلووس (ملساء):- ڕووی ناوەوەی لوولەی چەکەکە لووسەو کەندولکەی تێدا نیە، نموونە چەکی ڕاو (تاپوور).

٢- حوجرە: ئەم بەشە ئامادەکراوە بۆ فیشەك (خرطوشة)، ئەم بەشەش دەکەوێتە کۆتایی لوولەی چەکەکە هەروەکو لە تفەنگ(بنادق) و دەمانچەدا هەیە.

٣- خزانە(مەخزەن): بۆ خەزن کردنی فیشەکەکان(خراطیش – اطلاقات).

٤- پەلەپیتکەو باوێژ(الزناد والگارق) ئەمانە ئامێری هاوێشتن پێك دەهێنن.

٥- عەیاری چەك: یەکسانە لەگەڵ بۆشایی لوولەی چەکەکەو تیرەی بنکەی گوللە یان هاوێشتراوەکە.

٦- فیشەك (العتاد): پێك دێت لە:

ا- زەرف(قەوان – الظرف):- بریتی یە لە لوولەیەك لە مس دروست کراو(نحاسی)، بارودی لەناو دانراوە.

ب- کە پسولە(الکسولە):- دیسکێکی کانزایی یە جێگیرکراو یان لکاوە بە بنکەی قەوانەکە ماددەیەکی خێرا گرگرتووی تێدایە.

ج- گوللە(هاوێشتراو – مقذوف): پارچە کانزایەکە لە مس یان رصاص یان نیکل یان تێکەڵاو جێگیر کراوە لە بەشی پێشەوەی (دەمی) قەوانەکە وە ئەم بەشە تاکە بەشە کە بەرەو هەدەف دەردەچێ.

میکانیزمی دەرچوونی گوللە لە چەکی ئاگرینەوە(الية الإطلاق من الأسلحة النارية):-

کاتێك پەستان دەخرێتە سەر پەلەپیتکەکە، باوێژ(الطارق) دەگاتە دوورترین مەودا و پاشان دەگەڕێتەوە بەهێزو بەخێرا بۆ باری پێشوو، بەمەش دەرزی یەکە دەفع دەکرێ و بنکە کەپسولە دەکوتێ، بەمەش پێکهاتەکانی کەپسوولەکە دەتەقنەوەو پریشکەو گەرمی زۆر(٣٥٠٠ - ٤٥٠٠م) بەناو کونەکاندا تێپەڕدەبێت بۆ ناوەوەی کەپسولەکەو بارودەکە دەسوتێنێ و غاز دروست دەکات بەبڕی زۆر زۆر، بەمەش پەستانێکی بەرز پەیدا دەبێت کە خەملێنراوە بە ١٠ - ١٥ تەن/ یەك گرێ(عقدە). بەمەش گووللەکە بەرەو پێشەوە دەفع دەبێت بەهێزێکی زۆر زۆرو بەخێراییەك کە دەگاتە(٦٠٠ - ٣٥٠٠) پێ/ چرکە، هەروەها گەردیلە بارودی نەسووتاو یان سووتاو بەشێوەیەکی جزئی یان بەتەواوی لەگەڵ دەردەچن، هەروەها پاشماوەی سووتانی بارودەکەو غاز لەگەڵیدا دەردەچن لە دەمی(فوهە) لوولەی چەکەکەوە کە لەلای پێشەوەیە و هەموویان بەرەو هەدەف بەڕێ دەکەون.کەواتە دەرەنجامەکانی سووتانی بارود ئەمانەن (نواتج احتراق البارود):-

١- گڕی ئاگر(لهب النار) لە دەمی چەکەکەوە دەگاتە مەسافەی یەك پێ(١٥-٣٠ سم) لە دەمی پێشەوەی لوولەکەوە، دەبێتە هۆی سووتانی جل و بەرگ و پێست وەسووتانەکە بەوە جیا دەکرێتەوە کە ووشکەو دەرەجە یەکە وهەرزووڕانی (شعرطة) لە مووەکان دا هەیە.

٢- گاز: گاز بە بڕی زۆر دروست دەبێت وەکو ($CO$, $CO_2$, $H_2O$, $O_2$) و هی تریش. یەك گرام بارود (٢٥٠ - ١٠٠٠)سم٣ گاز دروست دەکات وەمسافەکەی ڕۆیشتنی (مداه العصفی) دەگاتە چەند سانتیمەترێك (٥سم) یان زیاتر.

٣- ڕەش بوونی بارودی دووکەڵاوی (الاسوداد البارودی الدخانی): بریتی یە لە گەردیلەی بارودی سووتاو بە شێوەیەکی تەواو، تێبینی دەکرێت لەدەورووبەری شوێنی چوونە ژوورەوەی گوللە یان (طلق ناري) بەرەو هەدەفەکە(لەش)، لەسەر پێست و جلو بەرك بەشێوەی ناوچەی ڕەشی دووکەڵاوی دەردەکەوێت و بەسڕینەوە دەڕوات و دەگاتە مسافەی ٤٥سم (پێ یەك و نیو).

٤- کوتانی بارودی(الوشم البارودی):- بریتی یە لە گەردیلە بارودی نەسووتاو یان سووتاو بە شێوەیەکی جزئی و شکاو (پارچە پارچە بوو) لەناو پێست دا دەچەقێت و هەروەها لە جل وبەرگیش دەچەقێ، لە بەرئەوەش کە وەزنی قورسە( واتە قورسترە

لەو گەردیلە بارودانەی کە بەتەواوی سوتاون واتە بوون بە دووکەڵ بۆیە دەگاتە مسافەی دوورتر،نزیکەی ٣ پی(٩٠سم)، ئەم کوتانە ش ماوەی چەند رۆژێك یان چەند مانگێك دەمێنێتەوەو بە سرینەوە(مسح) وشوشتن ناڕوات.

بوونی ئەم سێ نیشانەیە ناسراوە بەنیشانە نزیکەکانی گوللە باران کردن(عناصر علامات الاطلاق القريب) و بریتییەلە : سوتان ، رەش بوونی بارودی و کوتانی بارودی.

تێبینی: ئەو ژمارانەی مەسافی رۆیشتن نەگۆر نیە بەڵکو نزیکەییە و بە جۆری چەك وجۆری فیشەك دەگۆڕێ.

٥- بریسکەداری پشتەوە(الوميض الخلفي):-

ئەمە تەنها لەو دەمانچانە تێبینی دەکرێت کەبەشێوەی خڕیلە(بكره) ڕێك خراون(دەمانچەی تۆپڵ)،ئەمەش بەهۆی نەبوونی بەربەستێکی باش لە نێوان لوولەو حجره، ئەمەش دەبێتە هۆی سووتانێك لەدەستی ئەو کەسەی کە دەیتەقێنێت، بەتایبەتی ئەوانەی خۆیان پێ دەکوژن (منتحرين)، وە سوودی لێ وەردەگرێ بۆ دەست نیشان کردنی جۆری چەکەکەو دەست نیشان کردنی کەسەکە(الرامي).

زەرەرەکانی هاوێشتراوە ئاگرینەکان(گوللە):-

دیاردەکانی بەرکەوتنە جەستەییەکانی فیشەکەکانی چەکی ئاگرین و دەرەنجامەکانی هەر لە برینەوە تا لێك دانی جۆراو جۆر(اضرار المقذوف الناري، مظاهر الاصابات الجسمانية لعتاد والاسلحة النارية وما تنتج من الجروح والتخريبات المختلفة):

لەلوولەی چەکەکەوە هاوێشتراوە ئاگرینەکە دەردەپەڕێت کە هێزێکی پاڵنەری زۆری دەست کەوتووە بەرەو پێشەوە، لە پێچەکانی چەکەکەدا هاوێشتراوەکە دەسوڕێتەوە بەدەوری تەوەرەیەکدا شان بەشانی دەرچوونی بەرەو پێشەوە، خێرایی جوولەی فیشەکەکە(هاوێشتراوەکە) دەوەستێتە سەر جۆری بارودەکەو برەکەی و جۆری چەکەکە، بەخێرایی جیا جیا دەردە پەڕێت وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد، وە تێك وپێك دانی کاریگەر جیاواز دروست دەکات کاتێك بەر نیشانەکە (الهدف) یان لەشێك دەکەوێت.

- هاوێشتراوە ئاگرینەکە دەبێتە هۆی بڕین(قطع) و لەدەست دانی شانەی تایبەتی پێست بەم شێوەی خوارەوە:-

١- دەبێتە هۆی برینێك دوای چوونە ژوورەوەی بۆناو لەش، ئەمەش پێی دەووترێت دەرچەی چوونەژوورەوە (الفتحە الدخولیە) یان (مدخل الطلق الناري)، هەروەها برینێکی تر دروست دەکات دوای ئەوەی لەش جێ دێڵێت( واتە دەرچوونی لە لەش)،ئەمەش پێی دەوترێت دەرچەی چوونەدەرەوە( الفتحة الخروجية) واتە (مخرج الطلق الناري).

٢- تەنها دەرچەی چوونەژوورەوە دروست دەبێت ئەگەر هاوێشتراوەکە لەناوەوەی لەش دا جێگیربێت و لێی دەرنەچێت.

٣- تەنها دەرچەی چوونە دەرەوە دیاردەبێت کاتێك هاوێشتراوەکە لە یەکێك لە دەرچە سروشتی یەکانی لەش(وەك دەم) دەچێتە ژوورەوە بۆنمونە لە حاڵەتی خۆکوشتن یان تۆڵەسەندنەوە، یان هەندێ جار لەڕێگەی دەرچەی زاوزێی مێینە یان دەرچەی کۆمەوە ئەمە لەحاڵەتی کوشتن بەمەبەستی هەتك).

٤- هەندێك جار تێبینی دەرچەی چوونە ژوورەوە دەکەین(هەیە) بەڵام دەرچەی چوونەدەرەوە دیار نی یە، وە هاوێشتراوەکەش دیار نی یە لەکاتی تەشریح کردنی تەرمەکە: چونکە لەوانەیە چووبێتە ناو گەدەو خوێن بەربوونی تێدا دروست کردبێت و بووبێتە هۆی ڕشانەوەو فڕێ دانە دەرەوەی هاوێشتراوەکە (فیشەك) لەگەڵ ڕشانەوەکەدا، یان ئەوەتا چوتە ناو ڕیخۆڵە و لەوانەیە لەگەڵ پیسایی کردندا لەدەرچەی کۆم بێتە دەرەوە.

٥- دروست بوونی دەرچەی چوونەژوورەوە ك لەلێوارەکاندا برینێك یان زیاتر هەن و لەئەنجامی کاریگەری ساچمە دروست بوون، یان ئەوەتا دەرچەی چوونەژوورەوەو چوونەدەرەوە هەیە کە لەلێواری دەرچەی چوونە دەرەوەکە برینێك یان زیاتر هەیە و لەئەنجامی تێك شکانی(تقت) هاوێشتراوە کە یان تێك شکانی ئێسك دروست بووە.

٦- هەندێك جار هاوێشتراوەکە دەبێتە هۆی دروست بوونی زیاتر لەدەرچەیەکی چوونەژوورەوە یان چوونە دەرەوە: بۆ نموونە چوونەژوورەوەی هاوێشتراوەکە بەناو باڵ دا(ذراع) کاتێك باڵەکە خرابێتە سەر سنگەوە پاشان دەرچوونی لەلاکەی تری باڵ و چوونە ژوورەوەی بۆ ناو سنگ و دەرچوونی لەپشت، نموونەی تریش هەن، ئەمە بەگوێرەی چۆنیەتی هەڵکەوتنی کەسی بەرکەوتوو بە فیشەکی ئاگرین، وەئاراستەو دووری هاوێشتراوەکەیە.

## تایبەتمەندیەكانی برینە ئاگرینەكان(ممیزات الجروح الناریة):

أ- تایبەتمەندیەكانی دەرچەی چوونە ژوورەوە(ميزات فتحة الدخول – مدخل الطلق الناري)

١- زۆربەی جار بچووكەو ڕێكەو شێوەی بازنەیی یە، تیرەی یەكسانە بە تیرەی هاوێشتراوەكە لەمسافەی دوور.

٢- ئەلقەی داڕووشان(الطوق السحجي_الحلقة الرضية) ئەمەش چونكە پێست نەرم دەبێتەوە لەكاتی بەركەوتنی بە هاوێشتراوەكە كە بەهێز بەرەو پێست بەرێ كەوتووە و پێستەكە لادەدات(انسلاخ) و ئەلقەیەكی داڕووشاو دروست دەكات بەر لە چوونە ژوورەوەی هاوێشتراوەكە بۆ ناو لەش، هەندێك جار ئەلقەیەكی تری لەگەڵ دا دەبێت كە پێ ی دەڵێن ئەلقەی سڕینەوە(طوق المسح) كە بریتی یە لەلێوارێكی ڕەش كاتێك ڕوودەدات كە هاوێشتراوەكە وچەوری سووتاو (زيت محترق) كە پێوەماوەتەوە دەسڕێتەوە(يمسح) پێش چوونەژوورەوەی بۆ ناو لەش.

٣- ئاراستەی شانە پچڕاوەكە (الانسجة الممزقة) بۆ ناوەوە دەبێت ئەمەش بەپێی ئاراستەی ڕێچكەی هاوێشتراوەكەیە بۆ ناوەوەو پاڵنانی شانەكە بەو ئاراستەیە.

٤- بوونی نیشانەكانی هاوێشتنی (اطلاق) نزیك كە بریتین لە سووتان، ڕەش بوون و كوتانی بارودی (الوشم البارودي) لەدەوروپشتی دەرچەی چوونەژوورەوە كاتێك گوللە بارانەكە (هاوێشتنەكە) لە مسافەیەكی نزیكەوە بێت.

ب- تایبەتمەندیەكانی دەرچەی چوونەدەوە(ميزات فتحة الخروج – مخرج الطلق الناري):-

١- زۆربەیجار گەورەترە لەدەرچەی چوونە ژوورەوە، لێوارەكانیش نارێك و پێكن(مشرشرة)، بەڵام ئەگەر بەركەوتنەكە لە شوێنێكی ئێسكین بێت دەبێتە هۆی تێك شكانی ئێسكەكە بەمەش ئێسكەكە دەرچەی چوونە ژوورەكە فراوان دەكات ودەرچەی چوونە ژوورەكە گەورەتر دەبێت لە دەرچەی چوونە دەرەوە. هەروەها كاتێك نیشانەكە(هدف) لە مەودای كاریگەری گازەكاندا بێت(زۆر نزیك) دەرچەی چوونە ژوورەكە فراوانتر دەبێت و گەورەتر دەبێت لە دەرچەی چوونە دەرەوە.

٢- ئەلقەی داڕووشان، ئەلقەی مەسح نیە لە دەورووبەری داو نیشانەكانی هاوێشتنی نزیكی وەكو ڕەش بوونی و سووتان نابینرێت لەدەورووبەریدا.

٣- ئاراستەی شانەکان بەرەو دەرەوەیە، واتە لێواری برینی دەرچەی چوونەدەرەوە قەلب بۆتەوە(هەڵگەڕاوەتەوە) بەرەو دەرەوە چونکە کاتێك هاوێشتراوەکە لەلاکەی تری لەش دەردەچێت پاڵ بە شانەکانەوە دەنێت بەرەو پێشەوەو بۆ دەرەوە، هەر بۆیەش هەندێك جار دەبینین بەشێك لە ریخۆلە هاتۆتە دەرەوە لەدەرچەی چوونە دەرەوە و هەروەها خوێن بەربوون زیاتر لە دەرچەی چوونە دەرەوە دەبینرێت، بەلام لە دەرچەی چوونە ژوورەوە خوێن بەربوون تێبینی ناکرێت

**چۆنیەتی دیاری کردنی ئاراستەو مسافە (دووری) هاوێشتراوە ئاگرینەکە (کیفیة تعیین الاتجاە والمسافة):**

أ- **دیاری کردنی ئاراستە(تعیین اتجاە الکلق الناری):-**

ئاراستەی هاوێشتنەکە بەوە دیاری دەکرێت کە هێڵێکی ڕاست بکێشین لەنێوان دەرچەی چوونە ژوورەوەو دەرچەی چوونە دەرەوە، ئەمەش بەزانینی دەرچەی چوونە ژوورەوە ودەرچەی چوونە دەرەوە بەهۆی ئەو سیفاتانەی کە باسمان کرد لەسەرەوە بەو مەرجەی کە هاوێشتراوەکە ئاراستەکەی نەگۆڕابێت کاتێك بەناو لەش دا دەڕوات، بۆ نموونە بەرکەوتنی بە تەنێکی(شتێکی) ڕەق وەك ئێسك ئاراستەکەی دەگۆڕێت.

٢- بەهۆی شێوەی دەرچەی چوونە ژوورەوە کە شێوەیەکی بازنەیی هەبێت مانای ئەوەیە کە ئاراستەی هاوێشتنەکە بەستوونی (عمودی) بووە لەسەر لەش، بەلام ئەگەر شێوەی هێلکەیی بێت ئەوە مانای وایە ئاراستەی هاوێشتنەکە بەلاری بووە بەزاویەیەکی تیژ.

٣- بەهۆی شێوەی ئەلقەی داڕوشان ومسح(زەیتی)، وە بەهۆی شێوەی ڕەش بوون و کوتانی بارودی یەوە(الوشم البارودی) بازنەیی ڕێك بێت واتە هاوێشتنەکە بەستوونی(عمودی) بووە، بەلام هێلکەیی بێت واتە ئاراستەی هاوێشتنەکە بەلاری بووە بەگۆشەیەك.

٤- ئەگەر دەرچەی چوونە ژوورەوە بەرزتر بوو لە دەرچەی چوونە دەرەوە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسەی لە ئاستێکی بەرزتر تەقەی کردووە، وەپێویستە چۆنیەتی هەڵکەوتنی لەش (وضعیة الجسم) لەبەر چاو بگیرێت.

٥-ئەگەر دەرچەی چوونە ژوورەوەکە لەلای ڕاستی لەشەوە بوو (ڕانی لای ڕاست) و دەرچەی چوونە دەرەوەکە لەلای چەپ بوو، ئەمە واتە ئاراستەی هاوێشتنەکە لەلای ڕاستەوەیە بۆچەپ وەهەروەها.

ب- دیاری کردنی هاوێشتراوە ئاگرینەکە( تعيين مسافة الطلق الناري):

دووری هاوێشتن(مسافة الاطلاق) بریتی یە لەو دووریەی کە لە نێوان دەرچەی (فوهە) پێشەوەی لوولەی چەکەکەو ڕووی دەرەوەی نیشانەکە(هدف) دایە، وە بۆ دیاری کردنی ئەم مسافەیە پشت دەبەستین بە شوێنەواری دەرەنجامی هاوێشتنە ئاگرینەکە کە لەسەر نیشانەکە دیارە:-

- بوونی سووتان و (شعوطة) واتە دووری نیو پی یە (نصف قدم) هەر قەدەمێك ٣٠سم.

- بوونی ڕەش بوونی باروتی واتە مسافەکە نزیکەی پیێ یەك و نیو دەبێت ٤٥ سم.

- بوونی کوتانی باروتی (الوشم البارودي) واتە نزیکەی سێ پێ دەبێت( ٩٠سم).

بوونی ئەم نیشانانە ئەوە دەگەیەنێت کە دووریهاوێشتنەکە نزیکە لە مەودای یەك یاردەیە (٣پێ- ١٠٠سم) وە هەروەها پشتی پێ دەبەستین بۆ دیاری کردنی لە شێوەی دەرچەی چووتە ژوورەوەوە ئەمەش بەگوێرەی مسافەکە دەگۆڕێت و با بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەست پێ بکەین:-

١- ئەگەر لوولەی چەکە ئاگرینەکە بە نیشانەکەوە نووسابێت و پەستانیشی خرابێتە سەر( واتە پێك وەنووسان و پەستانیش هەیە، مسافه صفره) ، لێرەدا دەرچەی چوونە ژوورەوەکە بەشێوەیەکی کونێکی بازنەیی یە و ڕێکە، دەوروەدراوە بە تەورێکی گۆوان(طوق كدمي) کە شوێنەواری دەمی لوولەی چەکەکەیە لەسەر نیشانەکە ،وەهەموو پێکهاتەکانی هاوێشتنەکە دەچنە ناو نیشانەکەو تێبینی شوێنەواری دەرەنجامی هاوێشتنەکە دەکرێت هەر لە ڕەش بوون و سووتان و کوتان(وشم) لەناو برینەکەوە بە دووری چەند سانتیمەترێکەوە.

٢- ئەگەر دەمی لوولەکە نووسابێت بە نیشانەکە بێ ئەوەی پەستانی بخرێتە سەر یان لەدووری چەند سانتیمەترێك بێت(٣-٥)، ئەوا شێوەی دەرچەی چوونە ژوورەوە خاچی دەبێت(صليبي) یان ئەستێرەیی دەبێت (كوكبي – نجمي)، یان ناڕێك و لێوار گونج گرنج دەبێت (مشرذم الحافة)، ئەمەش چونکە لەژێر کاریگەری وورووژمی گازەکان دایە کە دەبنە هۆی جیابوونەوەی پێست لە شانەکانی ژێر پێست(

(subcutaneous tissue بەدووی دیار کراو و شێوەیەکی ئەستێرەیی پێی دەبەخشێت و دەرچەکەش دەورە دەدرێت بە نیشانەکانی هاویشتن لە نزیکەوە کە بریتین لە سووتان و مووهەرزوران و رەش بوونی بارودی (الاسود البارودی) و کوتان(وشم)، لەم بارەدا دەرچەی چوونەدەروە بچووکترە لە دەرچەی چوونە ژوورەوە.

٣- ئەگەر مەودای(دووری) هاویشتنەکە زیاتر بێت لە کاریگەری گازەکانەوە واتە دوورتربێت لە ٥سانتیمەتر تاوەکو ١٥سم، ئەوا دەرچەی چوونە ژوورەوە بەشێوەکی بازنەیی و لێوار رێك دەبینین لە دەوریدا ناوچەیەکی سووتان هەیە لەگەڵ رەش بوون وکوتانی بارودی.

٤- لەدووری تا ٤٥سم تێبینی رەش بوون وکوتانی بارودی دەردەکەوێت.

٥- دەرکەوتنی کوتانی بارودی تامەودای سێ پێ-٩٠سم دروست دەبێت و هەرچەند مسافەکە نزیك تربێت تێ چەقینی گەردیلە بارودی یەکان چرتر دەبێت و هەرچەندە مسافەکە دوورتربێت( لەمەودای ٣ پێ) فراوانی ناوچەی کوتانە بارودی یەکە (الوشم البارودی) زیاد دەکات و ناوچەی تێ چەقینی گەردیلەکان زیاتر لێك دوور دەبن.

٦- پاش دووری یەك یاردە(٣پێ-٩٠سم) هیچ شوێنەوارێکی پاشماوەی بارود(نیشانەی هاویشتن لە نزیکەوە) بەدەر ناکەوێت.

لەدەوری دەرچەی چوونە ژوورەوە، ئەو کاتە دەڵێن مسافەکە دووربووە ودەیخەملێنین لە زیاتر لە سێ پێ.

پرسیارو روونکردنەوەی پێویست کە دەسەڵاتی لێکۆڵینەوە داوای دەکات (الاسئلة والایضاحات المفروض طرحها من قبل السلطة التحقیقیة):

١- بەرکەوتنەکە چەکی ئاگرینە؟

٢- جۆری چەکی بەکارهاتوو؟.

٣- ئاراستەی هاویشتنەکە؟.

٤- مەودای هاویشتنەکە؟.

٥- کامە چەکی بەکارهاتوە؟ ئەمەش کاتێك کە چەند چەکێك لەیەك جۆر هەن و گومانیان لێ دەکرێت.

٦- بەرکەوتنەکە بەرێکەوت بووە یان تاوانکاری بووە یان خۆکوژی بووە؟.

٧- هۆی مردنەکە چی‌یە؟

بۆ ئەوەی بزانین کە بەرکەوتنەکە ئاگرینە (دەرئەنجامی هاوێشتنی ئاگرینە) -تێنی بوونی دەرچەی چوونە ژوورەوە (یان دەرچەکانی چوونە ژوورەوە) و دەرچەی چوونە دەرەوە (یان دەرچەکانی چوونە دەرەوە)ی هاوێشتە ئاگرینکە دەکەین بە هۆی ئەو تایبەتمەندی‌یانەی کە لەسەرەوە شەرحمان کرد.

-بۆ زانینی جۆری چەکەکە لە حاڵەتی دۆزینەوەی هاوێشتراوەکە لە ناو لەشدا بە هۆی جۆری هاوێشتراوەکە وعەیارەکەی وشێوەکانی دەرچەکانی چوونە ژوورەوە وەهەروەها بە هۆی نیشانەی تری وەکو تروسکە (وشیض)ی دواوە (گەڕاوە) کە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە دەمانچەکە بەکرەدارە (تۆپل) وهەروەها بۆ زانینی ئەوەی کە ئایا چەکی بەکارهاتوو خۆیەتی یان نا، ئەمەیان بەرپرسیارێکی لێکۆڵینەوەی تاوانەو هەرگیز دوو چەکی لێك چووو وەیەك بەرێژەی ١٠٠٪ بە ووردبین وەك نابن، وەشوێنەوارە ووردبینی‌یەکانی ڕووی ناوەوەی لوولەکە کە لە ئەنجامی بەکارهێنان پەیدا بووە یان ژەنگ هێنان یان پیسی، لە دوایدا لەسەر ڕووی هاوێشتراوەکە (فیشەکەکە) شوێنەواری بەدیار دەکەوێت.

بۆ زانینی جۆری چەکی بەکارهاتوو بەو چەکەی کە گومانی لێدەکرێ چەند فیشەکێکی تاقکردنەوە دەهاوێژن پاشان بەراووردیان دەکەین لەگەڵ ئەو هاوێشتراوەی کە لە تەرمەکەدا دۆزراوەتەوەو دەرهێنراوە لە کاتی تەشریح کردنی، ئەگەر گوللەی دۆزراوە وتاقیکراو لێك بچن ئەوا مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو چەکەی کە بەکارهاتووە خۆیەتی، هەروەها بەهۆی زانینی ئەو کەندولکانەی کە لەڕووی ناوەوەی لوولەکەدا هەن و ئەو شوێنەوارانەی کەلەسەر گوللەکە جێیان هێشتووە لەکاتی تێپەڕبوونی بەناویدا دەتوانین چەکی تاوانەکە بدۆزینەوە.

سەرەڕای ئەمانە بەڵگەکانی هاوێشتن:

ا-گەرمی لوولەکە، وە بڕی ئەم گەرمی‌یەش زیاددەکات بە زیادبوونی ژمارەی تەقەکان.

ب-بۆن کردنی دەمی پێشەوەی لوولەکە، چونکە بۆنی بارود تا چەند سەعاتێکیش هەردەمێنێت.

ج-پێدا تێپەڕکردنی پارچەپەمۆیەکی تەڕ بەناو لوولەکە بۆ پاك کردنەوەی ڕووی ناوەوەی، پاشان کوشینی بۆ لێکۆڵینەوەی کیمیاوی لەو مادده بارودی‌یانەی کە نیشتووە تیایدا.

ئانینی چۆنیەتی دیاریکردنی ئاراستەوە دوا باس کرا لە بابەتەکەی سەرەوە

یا حاڵەتەکە حاڵەتی خۆکوشتنە؟(هل الحالة انتحارية)؟-

دەم)دیراسەکردنی بارودۆخی کەسە مردووەکە(ظروف الشخص المیت):

- لەوانەیە تووشی هەرەسێك هاتبێت لە بازرگانی یان لە پەیوەندی سۆزداری، یان نەخۆشی عەقلیو دەروونی بەهۆی خێزان وکۆمەڵگاوە کەچی لە حاڵەتی تاوانکاری بوونی دوژمنداریو ناکۆکی هەڕەشە.

٢)دیراسەکردنی شوێنی ڕووداوەکە: کەسێك خۆی بکوژێت دەرگا لەسەر خۆی دادەخات، وە کەل وپەلەکانی ژوورەکەرێك وپێك دەمێنەوە وهیچ شوێنەوارێکی بەرگری تێبینی ناکرێت، زۆرجاریش نامەیەك بەجێ دەهێڵێ وە کاری خۆکوشتنەکە تیادا ڕووندەکاتەوە، بەڵام لە حاڵەتی کوشتنی تاوانکاری دەرگاکە کراوەتەوە یاخود لەدەرەوە پێوەدراوە، وە کەل وپەلەکانی ناو ژوورەکە سەرەوژێری پەرت وبڵاوکراوە کە نیشانەی بەرگری لە خۆکردنی هەیە.

٣) زۆربەی قوربانیەکانی خۆکوشتن بە چەکی ئاگری لە پیاوانە، بەڵام ئافرەتان یان خۆیان نقوم دەکەن یان خۆیان دەسوتێنن یان خۆیان ژەهرخوارد دەکەن وە ئافرەتی مردوو بە گولله تاوانکاری دادەنرێت یا پێچەوانەی دەسەلمێنرێت.

٤)دەرچەی چوونە ژوورەوە: لە حاڵەتی خۆکوشتن برینەکە لە مەودای دەستی کەسەکەدا دەبێت وەبەزۆری لەناوچەی صدغیTemporal ، نیوچەوان، سەقفی دەم، ژێرچەناگە، ناوچەی دڵ و سەردڵ وەزۆربەی حاڵەتان یەك تەقەی دەکا وەلەوانەشە زیاتر لەیەك تەقە بکات.

- لەحاڵەتی تاوانکاری لەوانەیە دەرچەی چوونە ژوورەوە لە مەودای دەستی کەسەکەدا نەبێت، بەڵکو لە هەربەشێك لەبەشەکانی لەشدا دەبێت، وەلەزۆربەی ئەگەرەکاندا زیاتر لە یەك تەقە کراوە.

٥) لەحاڵەتی خۆکوشتن نیشانەکانی هاوێشتن لەنزیکەوە هەیە، واتە بوونی سووتان وردش بوون وکوتانی بارودی یان تەوقی سەحەجی یان تەوقی تەبعی (پێك وەنووسان بەپەستانەوە) لەدەوروو پشتی دەرچەی چوونە ژوورەوە، هەروەها تێبینی نیشانەکانی نزیك هاوێشتن لەئەندامەکانی ناوەوەش دەکرێت.

بەڵام لەحاڵەتی خۆکوشتندا مەرج نیە کە نیشانەکانی هاوێشتن لەنزیکەوە هەبن وەلەزۆربەی ئەگەرەکان دوورتر دەبێت لەمەودای گەیشتنی بەرهەمەکانی سوتانی بارود. بۆیە هەموو حاڵەتی خۆکوشتنەکە نیشانەی نزیك هاوێشتنی لەگەڵدایە، بەڵام

